شانۆیی

# ئۆقیانوسی مەرگەسات



نوسینی : صلاح جلال

چاپی یەکەم 2007

بەشی یەکەم:

(تاریکستانێکی تار ..شانۆیەکی ئەفسانەیی لە ناوەڕاستدایەپاسەوانی ئەفسوناوی وەکو هەیکەل بەسەریەوە وەستاوە و بەبێ جوڵە پێدەکەنێت )

ئەها..ها..ها (زنجیری زەنگەکە ڕادەکێشێت) (دەنگی مارشێکی سەربازی بەهێز ..شەپۆلی گەردەلولێکی ترسناك..مۆسیقایەکی دڵ تەزێن ..گڤەو هاژەیەکی گەورە لەناو تاریکستانەکەدا دێت تەم وتاریکیەکەی دەجوڵێنێت ..لەگەڵ لێدانی یەکەم زرنگەی ناکاتدا قریشکەی لەخەو ڕاچەنینی کارەکتەرەکان بەرز دەبێتەوە ..لەناو هەزارەها گیانی بێ جەستەدا هەر یەکە لە جێگەی خۆی دەقیژێنێت (کوڕ) بە سەرسامیەوە راست دەبێتەوە و لە تاوا دەکەوێتە خولانەوە لەگەڵ دوا هێزی مۆسیقا جەنگیەکەدا بە هەنگەشەلێ دەسوڕێتەوە )

کوڕ : دەبێت لە خەونێکی زڕ ڕاچەنیبێتم..یا لە مەیخانەی مەرگ و تاعونەوە فڕێ درابمە ناو ئەم تاریکییەوە. .( بەدەوری خۆیدا خول دەخوات) شەوە زەنگێکە هەر وەکو شارستانی خێڵە خێو و کۆشکی شاری جندۆکە ڕەنگ دەداتەوە (روی وەردەگێڕێت کچ 1دەبینێ بە شڵە ژاوی لێی دەچێتە پێشەوە ) ئەی تۆ ؟ ڕەنگە تۆیش وەکو من ئەژدیهای مردن هەڵی لوشیبێتی ؟ ! دەبێت وەك یەك لەم مەرگە ناوەختەیەدا گۆڕە شار کرابین ..دەی راست بەرەوە با بەیەکەوە سەمای ئەم گیان کێشانە بکەین ؟

کچ1 : ( بەگێژییەوە هەڵدەسێتەوە) تۆ بڵێیت مەست نەبوبێتین ؟..( هەنگاوێکی ئازاراوی دەنێت) سەیر بکە هەروەکو حەشیشە کێشێکی چەند ساڵە گێژو حۆل بوین ..دور نییە بەبێهۆشی تلیاکمان دەرخوارد درابێت؟!

کوڕ : تەواوی بێهۆشیەکانی ژیانمان بەسەردا زاڵ بوە ..تەنانەت ژیان و مەرگ لە گوڵدانێکی تاریکدا تێکەڵاو بون و سەراپای خوێنەکەمانیان داگیرکردوە ..روانینەکانمان ئاوێتەی چەند نەخۆشیەکی بۆگەنە..

(تاریکستانەکە هروژمێکی توندی پیا دێت ..تاریکاییەکە دەشڵەقێت و سەدان بروسکەی تیژ بەناویدا چەخماخە دەداتەوە ..کاراکتەرەکان چاویان دەکەوێتە سەر رێشکەو پێشکە ..هەردو کاراکتەرەکەی تر لە جێگەی خۆیانەوە دەکەونە هاوار )

کچ1؛ (لەجێی خۆیدا هەڵدەبەزێتەوە ) ئەوەش دو چارە ڕەشی ترە ..سەیریان بکە بزانە چەندە پەشۆکاو دیارن..ئاوازی مەرگی بەچکە پشیلەی سوتاویان کەوتۆتە سەردەم (رویان تیَ دەکات) دەی راست بینەوە بزانن لەچی تاریکیەکی بۆگەندا خۆرسك سەر خۆشی مەرگێکی بیَ ناونیشان بوین؟!

کوڕ : چەندە شێواون ..دەڵێی لەناو بۆریەوە لوش دراونەتە ئێرەوە (سەیریان دەکات) بۆ قسە ناکەن؟!

ژن : ئۆف چەندە هیلاکم ..بەجاریَ بڕستم لەبەر بڕاوە ..لاشەم یەکالاَ دەبێتەوە بروسکەی ناجۆر هاتۆتە ناو جەرگ و دڵ وهەناوم ..( چاو بەتاریکیەکەدا دەخشێنێت) شالاَوێکی بۆگەن لەناو سکمدا پەرش بۆتەوە ( بەپشتا دەکەوێت و ناڵینێکی سەخت دەکات)

کچ 2 : نازانم خەونم دیت..یان بەڕاستی بوین بەمیوانی ئەم تونە قفلٌ دراوە ?(سەیری ئەملاو لای خۆی دەکات لەتاوا سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕدەکاتەو( کوڕ پەلی کچ 1 دەگرێت و بەیارییەکی سامناکەوە لە دو کارەکتەرەکە دەچێتە پێشەوە)

کوڕ : سەیریان بکە،خەون دەگێڕنەوە (دەستی کچ1 بەردەدات و هەڵدەگەڕێتەوە )شارێکی بیَ شوێنەوارە دەبێت ناوی خەڵوزدانی مەرگی لیَ بنرێت..دیل خانەیەکی هەتا هەتایی ژیانە.....

کچ 1: ئەوەندە ترسناکە کە جگە لەدەزولەی گیان کێشان تروسکەیەکی تری تیانابینرێت..( دەستی رادەکێشێت و هاوار دەکات ) سەیر بکەن چی بەلاَیەکە شەپۆلی گەردەلول و کڕێوە و زریان و تۆفان و هاوار..سەراپای تێکەلاَوبون و هەروەکو ئۆقیانوسێکی مەرگی ناکات بێت؟!

کوڕ : وێنەی گۆڕستانێکی ئەبەدییە ..هەر وەکو گەردون لێرەدا خاپور کرابێت؟!

کچ 2 : رەشەبای مردن لاپەڕەی تەمەنی جوانە مەرگیان دەپێچێتەوە .

کچ1 : (بیَ ئاگایانە قیژەیەك دەکات) سەراپای ئەم ڕوبەرە پڕ بوە لە هەڵم و کلاَفەی ئاگر..( مێشکی خۆی دەگوشێت) هەروەکو یەئجوج لێرەدا لە دایك بو بێت بەو چەشنە مژدەی گیان دەرچون بلاَو دەکاتەوە ..شکی تیا نییە ئێمەش لێرەدا بە یەکجاری دەمرین؟!..

کوڕ : هەتاوەکو چاو بڕ دەکات هەربێشەلاَنی و چڕی و دوکەڵی لاشەی مرۆڤی بیَ ئاسەوارە ..(دەستی کچ1 دەگرێت و دەیخوڵێنێتەوە ) کچەکە سەیر بکە تاریکی بۆتە بەر بوکی شەوە زەنگی مەرگ ..من زۆر دەترسم ...لەوانەیە ئێمەش بکرێینە خەڵوزێکی سوتاو ...

کچ 1(دەستی کوڕەکە بەردەدات و قژی هەڵدەداتەوە ) لە هەمو لایەکەوە وێنەی مردنێکی ناکات دیاری دەدات ..( رودەکاتە هەردو کارەکتەرەکەی تر و بانگی کوڕەکە دەکات) وەرە کوڕەکە جوان لە هەمومان ورد بەرەوە ..بەتەواوی لاشەمان بۆتە قوڕە سورێکی شێلراوی مەرگێکی تازە...

**كـــورِ : ساته وەختێكی نەگریس و بۆگەنە (بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە و تف دەكات ) لەم بۆگەناوە پیسە ..هیواكانمان لەبەر بروسكەی گڕێكی نەبیندا دەوەرێتە ناو سارای ئەم دۆزەخە نەفرەتییەوە**

**(تیشك دەچێتە سەر پاسەوان لەسەر شانۆ ئەفسانەیەكەوە پێكەنینێكی تیژ دەكات و تاریكی دەچێتە سەری ..كاراكتەرەكان دەحەپەسێن و هیچ نابینن ..گیژاویكی بۆگەن دێت و زەنگێكی تیژیش تێكەلاَوی دەبێت ..هەردو كارەكتەرەكەی تر هەلَدەستنەوە و وەك لالَ دەكەونە گرِوگالَی سەرە مەرگ ).**

**ژن : هەروەكو لێرەدا لە دایك بوبێتم بەو چەشنە زمانم گیراوە ...ئۆف لەم چارە رِەشییە..هیچ وێنەیەكی رِابردوم نایەتەوە بەر چاو....بێشك ئێرە دۆزەخێكی بۆگەنە.(قژی دەرِنێتەوە و دەقیژێنێت) ژانێكی سەرسەختم توش هاتوە ئای لەم سەرگەردانیە؟!**

**كچ 1: دارِنی پەرِەی تەمەنمانە....گەلاَجارِی ژیانمان بەم گرِە نەبینە سوتێنراوە ...توشی كارەساتێكی هێندە ئالَۆز هاتوین وەكو دەواری خێو لاشەمانی تەنیوە....**

**( تاریكستانەكە ترسناكییەكی تاریكی تێدەكەوێت..زرنگەو زەنگ و هاوار لە هەمو لایەكیەوە دەنگ دەداتەوە كارەكتەرەكان بە ترسەوە سەیری یەكتری دەكەن )**

**كچ2 : پێدەچێت تاریك خانەی وێنە گرێكی جەلاد بێت ..وەكو زێرابی مردنێكی گشتی دیاری دەدات ..( سەیری ژنەكە دەكات ) وادیارە ئازارت زۆرە .. (رودەكاتە كاراكتەرەكان) تەواو تێك ترشاوە ئێوە سەیری بكەن ..لەشی یەك دێتەوە.**

**كـــورِ : وەكو فوی تێكرابێت بەو چەشنە لاشەی ئاوساوە ..لەم كونە دێوەدا مرۆڤ توشی هەمو كارەساتێك دەبێت ..(سەری بەسەر ژنەكەدا شۆرِ دەكاتەوە چەپۆكێك بەخۆیدا دەكێشێت و دێتە ئەم لاوە ) ئای لەم بەستەزمانە چی لێبەسەر هاتوە؟!**

**كچ1: دەردێكی نەزانراوی گرتوە..جەستەی وەكو پارچە ئیسفنجێكی ئاوساو دیاری دەدات تەواوی گۆشتەكەی هەلَماسیوە.**

**ژن : مێشكم قورس بوە ..وەكو پاپۆرِێكی وێلَ دەخولێتەوە ..لاشەم ئاوساوە وتەزوی ئاگری پیادێت (دەستی بەسكیەوە دەگرێت و دانەكانی جیرِ دەكاتەوە) هێندەم نەماوە ،بەم ئازارەوە توشی دەردێكی كوشندە بوم ..بەم بێهۆشیەوە دەمرم بە یەكجاری سەری كلَۆلَی دەنێمەوە ...**

**کچ 1:   کەستان هەستان بەخۆتان کردوە لە کوێوە هاتونەتە ئێرە ؟ سەیرە هەروەکو ماسی تۆپیوی سەر ئاو لەم گێژاوەدا دەخولێینەوە (رو دەکاتە هەمویان و بە حەپەساویەوە سەیریان دەکات ) چاو بەستەیەکی ئێجگار ترسناکە ..وەکو لەگەڵ نابینادا چاو شارکێ بکەین ....**

**کـــورِ :   دەبێت نەشتەرگای نەخۆشخانەیەکی نەزان بەنجی کردبێتم .؟ بەچەشنێك قۆڵم ژان دەکات، هۆشم بەخۆم نەماوە..**

**ژن :  ئێستا بە تەواوی هەست بەوە دەکەم کە بەراستی لەبەر دەستی پزیشکا بوبێتم ...ئازارێکی قوڵ جەستەمەی گرتۆتەوە ..گومان لەوە ناکرێت کە لە نەخۆشخانەیەکدا نەشتەرگەریم لەسەر کراوە ..ئۆف لەم بەڵایە؟....**

**کچ 1:  ئەوە لە هەر هەمومانەوە دەردەکەوێت ..سەرپاکمان رەنگمان تێك چوە ..هەر وەکو لەنەخۆشخانەیەکەوە فرِێ درابێتینە ناو ئەم زێرابە بێ ناونیشانە ..؟!**

**کچ 2:   وەکو نەهەنگێکی زل قوتی دابین..( رو دەکاتە کاراکتەرەکان پەنجە دەگرێتە تاریکیەکە) لە شوێنەوارێکی بێ جوگرافیا گیرساوینەتەوە ..تاقە کەسێك بۆی دیاری ناکرێت چی کیشوەرێکە؟ ! هەروەکو قارەیەکی بزرکراوی گەردونێکی بێ نەخشە بێت ..**

**ژن :   خۆکرد ژانێکی تۆقێنەر لە جەستەمدا سەری هەڵداوە ..ئۆف لەم کارەساتە چەندە سەخت دێتە بەرچاو ؟.. سکم وەکو کێوماڵی لەسەر کرابێت  بەو چەشنە هەرەس دەهێنێت  ..شەپۆلی ترسناکی بە ریخۆڵەکانمدا دێت و لەوەدان بتەقن و بەیەکجاری جەستەم شیتەڵ بکەنەوە ..( قیژەیەکی ترسناك دەکات و هەردو دەستی بەسەریەوە دەگرێت وبێدەنگ دەبێت)**

**کچ2:  (دەچێتە بەردەمی ژنەکە):**

**خانم تۆ چ ژانێکت هەیە ؟ قسە بکە ..بابەتەواوی لێت تێبگەم  ..بەیەکجاری شڵەژاویت  ..هۆشت بەخۆت نەماوە .. دەتوانیت لە خۆت رِابمێنیت بزانیت توشی چی بویت؟!**

**ژن :   لاشەم بەتەواوی گرِی سەندوە ..تەزوی گەرمایی هاتۆتە ناو دەمارەکانمەوە ..لەوە زیاتر هیچ هۆشێکم بەخۆم نەماوە ...**

**کـــورِ :   ئەم روبەرە تاریکە لە ئاگر پێك هاتوە ..شەپۆلەکان هەمویان  گرِاوین  ..هەوا تەنورە گرِی دۆزەخی لێدەبێتەوە  ..ئێمەش بوینەتە پارچەیەك لەبڵێسەی تیژی ئەم ئاگردانە قەقنەسە....**

**کچ 1:  سەیر بکەن گۆشەنیگای  وەیل دێتە بەرچاومان..بای سەرِ سەرِ بەئاشکرا دێت ودەچێت (بەدەوری خۆیدا دەسورِێتەوە ) بێ شك دۆزەخی تازە دەستکردە ؟ !بەرونی دیارە خواو فریشتەی تیا نەماوە ..دەبێت جەنگێکی تێدا کرابێت؟!**

ژن : نامۆییەکی ناوەختە تەواوی هۆشمەندیمی گرتۆتەوە ..هەروەکو بمەوێت یادێکی سامناك بهێنمەوە بیر ...ئای چی دەردێکی ترسناك و پیسم لیێ پەیدا بوە .....؟! (دەستەکانی بەیەکدا دەدات قیژەیەکی جەرگ بڕ دەکات)

کـــوڕ : توێشوی سەفەرێکی ئاڵۆز و چڕ لە ڕەنگ و روی هەمومانەوە دیاری داوە و هەرکەسێکمان چەند رەنگێکی تایبەتی لێنیشتوە..شێوەی مردن و ژیان و ئازار و سێدارە و بیێ هۆشی لە هەمومانەوە دەردەکەوێت..

کچ 1: ئێمە کۆمەڵێکی بیێ ناونیشانین ..بیرەوەریمان تەنها لە مردن و گیان دەرچون پێك هاتوە ..ئەم تاریکیە بە شەپۆل و تەوژم و هاژە و ناڵین و هاواریەوە سەراپای سرودی مەرگێکی گشتی مرۆڤایتیە ....

ژن : حەزدەکەم بەکوڵ بگریم ..رومەتم تامەزرۆی ئەسرینە ..هەرچەند دەکەم ناتوانم قوڵپێك بدەم ..هەروەکو چاوم لەئاستی فرمێسکدا کوێر بوبێت..تەواوی ناڵینەکانیشم خەفە کراوە ..هاکا لەناوەختەدا پێی تەقیمەوە ....

کـــوڕ : گریەو پێکەنینمان ئاوەژو بوە ..زۆر سەیرە ئەو دڵۆپە سوێرەمان لیێ تۆراوە ..( دەست بە سەریەوە دەگرێت و نەرمە سەمایەك دەکات ) بوین بەلێبوکی گاڵتەجاڕی تەواوی مێژو...

کچ 2: زۆر حەز دەکەم بتریقێمەوە و بە ئارەزوی خۆم پێبکەنم و هاو هۆی سەمایەکی خۆش بکەم ..هەرچەند دەکەم توانای گریان و پێکەنینم نیە ....ئای لەم کارەساتە سەر لێشێواوە .

کچ1 : مێشکم بەتەواوی ئاوساوە تاقە وێنەیەکی تێدا نەماوە ..ئێوە بزانن بیرەوەریەکانتان نایەتەوە یاد ؟!.

ژن : کام بیرەوەری و وێنەیەمان بێتەوە بیر..ئێمە ئێستا نازانین چی گیاندارێکین جگە لەوەش هەست بەهیچ جوڵە و بزوتنەوەیەك ناکەین..؟!

کـــوڕ : لەناو ئۆقیانوسی مردنێکی بیێ مۆڵەتدا دەخولێینەوە ..تەنانەت نەخشەو رەنگ و تام و لەزەتی تیا نیە ،بەبیێ ئەوەی بەخۆمان بزانین پرۆژەی چاوشارکێی مەرگمان پیێ دەکرێت ...

کچ 2: لەسەر و خواری ئەم تاریکیە تەنها شەپۆلی تیغی مردن دیاری دەدات...دەبێت کۆشکی نێوەندی پیاو کوژەکانی جیهان بێت ؟!

کچ 1: پانسوێنی فریشتە کوشتارکەرەکانی خوایەکی دڕندەیە...

کـــوڕ : سەیربکەن بزانن کۆشکێکی نەبین نادۆزنەوە .

ژن :   لەنێو ئاسەوارێکی قەقنەسدا شوێنەوار نابینرێت .بیرکردنەوەش بیّ ئەنجام دێتەوە دەستمان..سەیر تەنانەت فریشتەو پێغەمبەرێکی تێدانیە؟ !دەبێت بۆشاییەکی تازەی خوداوەند بێت؟!

کـــوڕ :   شك دەبەم ئەستێرەیەکی تازەی ئەم گەردونە بێت و بە ئێمە دۆزرابێتەوە ؟ کیّ دەڵێت سەربازی لەشکرێکی جەنگی نەبوین؟ ! (کاراکتەرەکان لەخۆیان ورد دەبنەوە ..بەحەپەساویەوە دەکەونە خولانەوە ...)

کچ 2:   لەوە دەچێت دیلی شەڕێکی بیّ ئاسەوار بین   ..هەست دەکەم ئێمە سەربازێکی رەش بگیر بوبێتین ؟

!(کچ 1 بەبیّ هۆشیەوە دەکەوێتە پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی )  سەرباز ..ئەها ..ها..ها  (سەیری کچ2 دەکات) بزانە کێمان سەرباز بوین ؟ جوان سەیرمان بکەن کاممان جلی سەربازی لەبەردایە ..؟!

کـــوڕ :   هیچ کامێکمان لە ئەفسەر و سەرباز و سەرکردە ناکەین و تاقە نیشانەیەکی سوپایی بەکەسمانەوە دیاری نییە ..

کچ1 :   من وای بۆ دەچم لەسەر چینێکی ئاسمانەوە کەوتبێتینە خوارەوە ؟ !دور نییە لەسەر مانگ گیرسابێتینەوە ؟!

ژن :دەبێت لەناو تەقینەوە ی سروشتەوە فڕیّ درابینە ناو ئەم جێگە پڕ لە سزایە؟!(دەستی بەسکیەوە دەگرێت و ناڵینێکی خەفە دەکات ) ئەنجامی ئەم دەردە ونەمان بنەمای کارەساتێکی گەورەی مێژوییە ...

کـــوڕ :   کەوتوینەتە ناو جێگەیەکی بیّ وەڵامەوە جگە لەپرسیار هیچی تری تیانیە وەڵامەکانیشی بەدوای پرسیارێکی تردا کۆچەرین....

کچ 1:   ئێوە تەواو سەیری خۆتان بکەن بزانن تەواوی جلەکانمان بەرگی بالیەو تویسە ..هەر وەکو ئێرە سەما خانەی سەرکردەیەکی خوێن خۆر بێت (سەیری کچ 2 دەکات) ئازیز لەخۆت بڕوانە ...سەیری پێڵاوەکانت؟!

کچ 2:   ئێرە لەنەخشەی جیهان چۆتە دەرەوە ،ئێمە کەوتوینەتە دوای کۆتایی هێڵی سفرەوە ؟!

کـــوڕ :شوێنەوارێکی تۆقێنەرە ..وێنە و ڕوخسار و روانینی تێدا نییە ..وەکو پاشماوەی دوای جەنگێکی کاولکەر شێوەی دەنوێنێت ...

**کچ 2 : کەسمان هۆشمان بەلای خۆماندا نەماوە نازانین چۆن واپەل بەست کراوین من گێژ و حۆل بوم هەتاوەکو ئێستاش تریشقەی ناکات لە مێشکمدا زەنگۆڵە دەدات..**

**ژن : جگە لەم ساتە هەست بەوە ناکەم قورساییەکم لە ژیاندا هەبو بێت ..**

**( کچ2 هاوار دەکات و سوڕێکی ئاڵۆزاو دەدات)**

**لەوانەیە توشی هێستریا بوبم ؟رەگی هاری لە کەللەی داوم ..خرۆشی مردن بە خوێنەکەم دا دەزولە دەکات .( چرِوچاوی خۆی دەرِنێتەوە )**

**ئەها چۆن توش بوم هەموتان لێم برِوانن ؟!**

**ژن: ئۆقرەم لەبەر براوە شالأوی مەرگ رِوی تیێ کردوم ،ژانێکی سەخت هاتۆتە ناو دلْمەوە ئای سزاکانی خوای ستەمکار ؟!**

**کچ1: (سەمایەکی شێتانە دەکات رو دەکاتە کچەکە) کورِە جوانەکە رەنگە من شێت بوبێتم ؟!ئەم دیمەنە تاڵە بەرچاوی تۆشی گۆرِیوە ئایا تۆش وەکو من هەست بە مردنی هەتاو ئەکەیت ؟!**

**کورِ: هەتاو ...هەتاو ..چەندە سەیرە لەوانەیە توشی دەردێکی کوشندە هاتبم ..لە گێژاوێکدا سەر خەو دەشکێنم زریانی نەخۆشی و دەردە ..ئۆف چەند بۆگەنە ...**

**ژن: ژیانمان وەکو نوکە نەشتەرێکی خوێناوی وایەو تەنها وێنەی کوشتار خانەیەکی تایبەتی لیێ دەردەکەوێت (رو دەکاتە کاراکتەرەکان) من ئێشێکی ترسناکم گرتوە (قژی هەڵدەداتەوەو دەقیژێنێت)**

**کچ2: ئۆف ژنی بەد بەخت وەرە تەواو چاوەکانت بکەرەوە ..وەرە لەگەڵما بسورِێرەوە ..ئەوسا دەزانیت کەوتوینەتە ناو چی شەپۆلێکی بیێ ئارامەوە (دەستی ژنەکە دەگرێت و لەگەڵێ خۆیدا دەیخولێنێتەوە) دەی خانم ئێستا دەزانیت چی دۆزەخێکە ؟!**

**ژن: (دەستی بەردەدات دەیخاتە سەر سکی و هاوار دەکات ) هەزار نەفرەت لەم ژیانە ،توشی چی دەردی سەریەك هاتوین ؟! لەم سامناکییە ؟**

**کچ1: لەناو گێژاوەکەوە بانگەشەی مردن دەبیسترێت..ئێوە گوێتان قولأخ بکەن ..بزانن چی بانکەوازێکی ترسناك دەکشێت ؟!**

**(کاراکتەرەکان گویێ هەڵدەخەن ..لەگەڵێ تەزوی بەهێزی شەپۆلەکاندا دەکەونە سەمایەکی مەرگاوی)**

**بەرەو کۆشکی خواوەندی ون کەوتوینە ریێ!**

**بەسەر پلەی مەرگ و ژیاندا !**

**چەند سامناکە ڕێی کاکێشان !**

**لەژێر کوانوی گڕ باراندا !!**

**(بەو ئاوازەوە لەیەکتری جیا دەبنەوە )**

**ژن: ئێرە زێرابێکی بێ نەخشەیە ..زۆر لەسزاکانی خواوەند پیسترە ..قەساب خانەیەکی خوێناوییە ..پێ دەچێت خوا لەم ترسناکیەدا کۆچی کردبێت بۆ دورگەیەکی تر ؟(دەست بۆ قولاّییە کە درێژ دەکات ) سەیر بکەن تەواوی جیهان لەم حەشارگە تاریکەدا توێنراوەتەوە .**

**کچ2: هەزاران لاشەی نامۆی تێدایە ..بەئاشکرا مەرگ بەناویدا دەکشێت(دەستی کچ1 دەگرێت ودەکەونە هەڵپەڕینێکی گیان کێشی)**

**کچ1: سەری ئومێدی ملیۆنەها لە باوەشی مەرگدایە ..(لەکچ2 جیادەبێتەوە) خونچە گەشاوەکانی ژیان بە مۆم دانی ئاگراوی هەڵوەریوە ..**

**کوڕ: ژیان رەنگی تارایەکی ڕەشی گرتوە...**

**کچ2: سەرپاکی مردوەکانی جیهان لێرەدا توێنراونەتەوە ..(دەست بۆ تاریکیەکە درێژ دەکات و دەخولێتەوە) ئەوە تێزابی لاشەی تواندنەوەیە...**

**ژن: (بە کڕوزانەوە قژی دەرنێتەوە) ئۆف لەم شەپۆلە ترسناکە چی ترسێکی خستە ناو دڵمەوە (دەستی بەسکیەوە دەگرێت) خواوەند ،ئێرە جەلادخانەی کام فریشتەی کوشتار کەرتە؟!**

**کچ1: جێگەیەکی بۆگەنە ..تەنانەت خەویشی زڕە،رەنگە لەکتێبە ئاینیەکاندا باس نەکرێت،کتێبی ئاینی باسی نەفرەت خانەیەکی وا دەکات ؟!**

**کچ2 : شکی پێنابەم تاقە دێڕێکم بیستبێت یاخود چاوم پێدا خشاندبێت..(سوڕێك دەخوات) ئۆف کتێبی ئاینی (لەخۆی ورد دەبێتەوە) چاوم پێی نەکەوتوە..**

**کچ1: تۆ ئەی کوڕە جوانەکە نەتخوێندۆتەوە ؟!(خۆی لێ نزیك دەخاتەوە) ئەوە چاکەتی ئامۆژگایە لەبەرتا دەبێت خوێندەوار نەبیت ؟! لەوە دەچێت پارێزەر بوبیت ؟! چەند ستەمە مرۆڤ هۆشی بەخۆی نەبێت (سەیری چاکەتەکەی دەکات ) وێنەیەك نایەتە ناو دەریای بیرو خەیاڵمەوە ئای لەم سەرگەردانییە ..**

**ژن: (دەستی دەخاتە سەر سکی و بەئازارەوە دەکەوێتە قسە) رەنگە هەمو نوسراوێکی ئاینی باسی ئەو کارەساتە سەختانە بکەن ؟!**

کچ2: (خۆی له ژنه‌كه نزیك ده‌كاته‌وه) خانمی ئازیز له‌وه ده‌كات قه‌شه بوبێت؟! جوان مێشكت بگوشه ..به‌ڵكو كورته‌یه‌كی كتێبی ئاینیت بێته‌وه به‌رچاو ..(ده‌ستی به‌سه‌رو قژیدا ده‌هێنێ وبۆسه‌ره‌وه هه‌ڵی ده‌داته‌وه) ده‌ی خانمه‌كه بیربكه‌ره‌وه.

ژن: (به‌حه‌په‌ساویه‌وه له‌خۆی ڕاده‌مێنێت) ئازار له‌شم شیته‌ڵ ده‌كاته‌وه ..مه‌رگێكی نه‌بین چاوه‌ڕێمه ،مێشكم وه‌كو تونی سوتاوی لێ هاتوه..له سه‌تاویدا چی بیره‌وه‌ریه‌ك دێته‌وه به‌رچاو ؟!

كوڕ: ئه‌و قولاَیه پڕه له جه‌سته (له‌جێی خۆیدا خول ده‌خوات) چاوم ڕێشكه‌و پێشكه ده‌كات ..لێره به‌دواوه هێزێكی ترسناك هه‌یه ..پڕه له ژه‌هرو شێی نه‌وه‌ویی..

ژن: قریشكه‌م دێته به‌رگوێ ..بروسكه‌یه‌كی ترسناك به‌جه‌سته‌مدا دێت ..پێ ده‌چێت لێره به‌دواوه هه‌زاران كه‌سی تری وه‌ك ئێمه هه‌بن؟! ئه‌وانیش توشی سزای خوای دڕنده بون .

کچ1: ئێوه بۆن ناكه‌ن؟!(وه‌رده‌چه‌رخێت) كه‌س هه‌ستی به‌خۆی نه‌كردوه ؟1ته‌نانه‌ت هه‌ناسه‌كانیشمان تفتن بۆنی لاشه‌ی مردو ده‌ده‌نه‌وه ..

کچ2: ده‌ردێكی كوشنده‌م گرتوه ..(پژمه‌یه‌ك ده‌كات) هاكا به‌و ژه‌هره توامه‌وه..

کچ1: ئه‌و قولاَییه ژه‌هراوێكی بۆگه‌نی تێدایه (چه‌ند هه‌نگاوێكی لێ ده‌چێته پێشه‌وه) ئێره..ئێره..(هه‌ناسه‌ی سوار ده‌بێت و به‌پژمه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه) وه‌خت بو بمرم..له‌وه‌دا بو لاشه‌م بسوتێنێ ئای له‌م گڕه‌یه ؟1

كوڕ: گڕی دۆزه‌خه ..ئاگرێكی بێ ڕه‌نگ و تامه..

کچ1: (رو ده‌كاته ژنه‌كه‌و به‌سه‌ری خۆیدا ده‌ماڵێت) خانم تۆ سكت هاڵماسیوه ..ده‌ڵێی فوت تێ كراوه ..ئایا هه‌ستت به‌خۆت كردوه كه منداڵت له سكدایه؟!

ژن: (به‌سه‌ر سامیه‌وه ده‌ی ده‌ست به‌سكیدا ده‌هێنێت و هاوارده‌كات) له‌م دۆزه‌خه‌دا سكم پڕبوه ..ئای خوای بێ ڕه‌حم هیچ یادێكم نایه‌ته‌وه بیر ..ئێستا تێده‌گه‌م ئه‌م ئازاره‌م هی ئه‌وه‌یه..(هه‌ردو ده‌ستی به‌سه‌ر سه‌ریه‌وه ده‌گرێت ده‌كه‌وێته گریان)

كوڕ: له خه‌ونیدا سكی پڕ بوه.

ژن: نه‌فره‌تی تۆ توشی ئه‌و كاره‌ساته‌ت نه‌كردبم؟(ده‌ست داده‌گرێت) تۆ..تۆ..

كوڕ: خانم ته‌واو سه‌رت لێ شێواوه ..ده‌بێت له‌خه‌ونێكی ئاڵۆز ڕاپه‌ڕیبیت ؟!

ژن: تۆ كوڕێكی نه‌وسن دیاریت..ڕه‌نگه سه‌دانی وه‌كو منت له‌و تاوانه‌وه ئالاَندبێ؟! گه‌نده‌مو به‌لاڕومه‌تته‌وه‌یه نه‌گریسیت..

کوڕ:   بیرم نایەت چاوم بەخانمێکی شۆخ کەوتبێت ؟!کێ دەڵێت هەرگیز تۆم دیوە ؟! خانم تۆ تاوانم دەخەیتە پاڵ.

ژن:   تۆ چڵێس دەردەکەویت ..ئای چەندە ناشرین دێیتە بەرچاوم ..دەڵێی مۆتەکەی؟1

کوڕ:   چی نەگبەتیەکە ..ئەم جندۆکەیە چۆن بەمنەوە گرتویەتی ..دەبێت حەشیشەی کێشابێت؟1

کچ1:   ئەو خانمە هۆشی بەخۆی نەماوە ..دەبێت مۆتەکە چوبێتەسەر سنگی .

کچ2:   رەگی هاری گرتوێتی چڕوچاوی بەتەواوی تێك ترشاوە .

کوڕ:     هێستریای گرتوە ..تەنها ئەو دەردە وا لەمرۆڤ دەکات ئێوە سەیری بکەن تەنانەت چڕوچاوی خۆشی ڕنیوەتەوە .

کچ1:   (دەچێتە بەردەمی کچەکە) خانم تۆ نازانیت لەکەیەوە سکت پڕبوە ؟!بیربکەرەوە بەڵکو بیرەوەری مێردەکەت بێتەوە بەر چاوت و واز لەم کوڕە بهێنیت...

ژن:   ئای لەم جادوە ..مێرد..مێرد..(مێشکی خۆی دەگوشێت و قیژەیەکی بێ تاوانی دەکات ) .

کچ 2 :    خانم زویر مەبە ..هەوڵ بدە باوێنەی ژیانت بێتەوە بەرچاو..گومان لەوەدا نییە هاوسەرت هەبو بێت؟!

ژن:   ئەمە ئەو پرسیارەیە کەوەڵامی نییە ..

کچ1:   دەبێت وەڵام چ بێت ..ئێستا تۆ سکت پڕەو شەڕ بەو کوڕە دەفرۆشیت..ئەمەش مانایەکی تر بەدەستەوە دەدات ..

ژن:   هیچ مانایەك نییە ..ئەوە ڕاستییە ..لێرەدا تەنها ئەو کاری وا دەکات ..خۆ تۆ سکت پڕ نەکردوم ؟

کوڕ:    هیچمان هەست بەو جیاوازیە ناکەین ..کێ دەڵێت  منیش کچ نیم ؟! یان ئێوە هەموتان کوڕنین؟!

کچ2:   بەرگەکانمان دەمامکن..رەنگە لەتاریك خانەیەك ئەم جلانەمان کرابێتەبەر ؟   ئەوەش ئەفسانەیەکە پەیوەندی بەو جادووەوە هەیە.

کچ1:   هەست ناکەم لە سوچێکی تردا چرکەیەك ژیابێتم .

کوڕ:   تەنانەت ئەم ساتەشمان بیر دەچێتەوە ..خەریکە بونی خۆشمان بزر دەکەین ..قسەکانمان لێ بۆتە پریاسکەیەکی ئاڵۆز

ژن:   ئەمەش پەیوەندی بەئەفسانەیەکی پیسەوە هەیە. رەنگە پابەندی نهێنی کتێبە ئاینیەکان بێت؟! ئای خواوەندی خوێن ڕێژ لەم مەرگە ساتە ..

(کچ1 دەستی دەخاتە سەر شانی ژنەکە) تۆ لەوە دەکات ژنی قەشەی کەنیسە بویێتی ؟! بزانە چیرۆکی کتێبە ئاینیەکانت نایەتەوە بەرچاو ؟!

ژن: دەبێت قەشە مانای چی بەخشێت؟! تۆتاوانێکی سەختم دەخیتە پاڵ.

کچ2: (بەگاڵتە جاڕییەوە دەکەوێتە هەڵپەڕکێ) قەشە..قەشە؟! پرچ درێژێکی چڵکنی ناوکەنیسە..

ژن: لەم ژانە سەر سەختەم (پرچی دەڕنێتەوەو هاوار دەکات) ڕیخۆڵەکانم ئاوسان لەوەدان بتەقن..

کوڕ: ئێمە مۆمیا بوین ..ڕەنگە هەزار ساڵ بێت لێرەدا بین؟! نازانم کات و چرکەو شوێن و سەرەتای تەمەنمان چۆنە؟!

کچ2: من دەمامکم بۆ کراوە ..ئێوەش جوان سەیری خۆتان بکەن ؟!

کچ1: ڕەنگە دەمامکێکی بوکێنیم بۆ کرابێت ؟! (پەلی کوڕەکە ڕادەکێشێت ) وەرە کورەکە بزانە بوکێکی جوانم ؟!(بەیەکەوە دەخولێنەوەو جیا دەبنەوە )

ژن: ئێوەش وەکو من سکتان پڕ بوە ؟! ئای خوای تاوانبار چی تۆڵەیەك بو لەمنت کردەوە ؟!
(کاراکتەرەکان لەیەکتری وردەبنەوەو تەزوی ئاگر بەلەشیاندا دێت)

کچ1: ڕەنگە کاتی خۆی کچێکی شۆخ بویێتم (چەپۆکێك بەکوڕەکەدا دەکێشێت ) جوان سەیرم کە بزانە کوڕم یان کچ؟!

کوڕ: (کوڕتوند مەمکی دەگوشێت) بزانە چی تامێکی خۆشی هەیە؟!

کچ2: تۆ دەمامکت بۆ کراوە (رو دەکاتە کچ1) لەنێوان حەڤدە هەتا حەفتا ساڵیدا دەخولێیتەوە ..دەبێت چەند سکێکت کردبێت؟!

ژن: تف لەم تاوانە..لەم سکە خۆ کردەم ..ئای ئەم نەفرەت خانەیە چ بو ئێمەی تیا لول دراین.؟!

کچ1: ئەمە وەکو خۆر گیران وایە(پێکەنینێکی دەست کرد دەکات) تاقە کەسێك نییە ئەو نهێنییەی بدۆزێتەوە..ئۆف دەبێت گەردەلولی خوا هەڵی کردبێت؟!

کوڕ: خۆر گیران.؟! ئەوە نیشانەیەکی ترسناك بو..دەبێت ئەوەش بو بێتە بەلآیەکی ترسناك؟!

کچ2: ستەمە مرۆڤ ناونیشانی خۆیشی نەزانێت (پێکەنینێکی ترسناك دەکات) ئێمە نەژادی خۆمان لەبیرچۆتەوە.. لەکوشتار گایەك بوینەتە کۆیلە ..وشەی خواوەندی تیادا بزر بوە ..(قاقایەکی تیژدەکشێت).

کچ1: ساتەکانی رابوردومان بەبێ ئاگاییەك بەلاماندا ڕادەبورێت وەکو لەناو سکی دڕندەیەکدا کەوتبینە خوارەوە..

کوڕ: دەبێت ئێرە شوێنەواری جەنگی جیهانی بوبێت؟!(سەیری چوار دەوری خۆی دەکات) ڕێك پاشماوەی جەنگی ساردە..

کچ1: ئاوازی هەزارەها کۆچ دێتە بەر گویێ..زریکەو هاواری منداڵ قیژەی ژن و پیاو ..

ژن: من توشی دەردێکی وا بوم قەت نەبینرابێت ..ئۆف سەراپامان بەئازارێکی نەزانەوە گرفتار بوین..(بەچەمۆڵ سنگی خۆی دەکوتێتەوە) وەك ئەژدیها بەناو سکمدا پێچ بخوات..(بەهەمو هێزی قریشکەیەکی جەرگ بڕ دەکات)

کچ2: تۆ بڵێیت برسیت نەبێت ؟! (قژی ژنەکە هەڵدەداتەوە) یاخود پارویەکی گەورە ڕیخۆڵەکانتی پڕ کردبێتەوە؟!

کچ1: پێدەچێت خواردنێکی خراپی خواردبێت .. ئینتەلای کردبێت ؟!

کوڕ: لەو سزا سەختە! ئێمە نانیشمان نەدیوە..ئێستا نازانم ڕەنگی چۆنە ..چۆن لەزەتی دێتە بێخی دانەوە..

کچ2: ئەم جیهانە نانی تێدا نییە تەنانەت کشتوکاڵیشی تێدا ناکرێت ..کوا سەیری بکەن خاك و خۆڵی نییە..

ژن: لێرەدا خواردنی مرۆڤ تەنها هەوای بۆگەنە ..هەر ژەقنەموت و ژەهراوە.

کچ1: بوین بەماسی ناو زەریایەك ژەهر خرابێتە ناوشەپۆلەکانیەوە و گێژی کردبین ..ئێستا لە چاوەڕوانی مەرگا وەستاوین..

کوڕ: جگە لەتاریکی زۆنگاوی بۆگەنی ئیدی تاقە شوێنەوارێك بەدی ناکرێت ..

کچ2: (بەدەوری خۆیدا خول دەخوات وهاواردەکات) ئەوەتا ئەوە وێنەیەکە (وێنەکە هەڵدەگرێتەوە) سەیر وێنەی کوڕێکی گەنجە ..چەندە ناسکە ..ئای چۆن دێتە ناوجەر گ و دڵەوە ..

کچ1: (وێنەکە لەکچ2 وەردەگرێت و سەیری دەکات) ئای کەحەزم لەکوڕێکی وا جوانە (وێنەکە بەسنگیەوە دەنوسێنێت) .

کچ2: شك نابەم چاوم بە لاوێکی ئاوا قۆز کەوتبێ ؟!

کچ1: (وێنەکە لەسەر سنگی لادەبات و سەیری پشتەکەی دەکات) سەیروەرن بزانن چی لەسەر نوسراوەتەوە (بەهێواشی دەیخوێنێتەوە):

ئەی ئەوانەی بێرەدا ڕادەبورن وریا بن دڵە مەزنەکەی( سەرکۆ ) گوناهەکانتان زیاد نەکات .

کچ2: کەواتە ئێمەش تۆز و خۆڵی جەنگێکی نادیارین؟!(دەستی کوڕەکە دەگرێت) وەرە بایەکتر ماچ بکەین..وەرە ناو دەمم هەڵمژە تا نەمردوین..وا دیارە لێرەدا دەکرێینە کای سەرملە؟!

کوڕ:   شکم نییه کچێکی جوانم دیبێت (ناودەمی کچ1 هەڵدەمژێت)نایەتەوەبیرم ماچم کردبێت؟!

کچ1:  (کوڕەکە بەخۆیەوە دەنوسێنێت) کوڕی جوان خۆت لەلاشەم بئاڵێنە بامنیش وەکو ئەو خانمە سکم پڕ ببێت..دەی ماچم بکە؟!

کوڕ:   دڵم مردوە ..نەهامەتیەکی وام بەسەردا هاتوە دەبێت نێرەموك بوبم..هەست ناکەم دەماری پیاوەتیم تێدا بێت..

کچ1:   مەمکم بگوشە..ئێرە دوا ساتی ژیانە(بەخۆیەوە دەینوسێنێت) ناو دەمم بمژە ..حەزناکەیت ژن ومێردێکی ئاسایی بین؟

(هەردوکیان ساتێك لێك دەئاڵێن، کوڕەکە لێی جیا دەبێتەوە)

کوڕ:   لەم تاریك خانەیەدا هەمو شتێکم بزر کردوە هەمو ڕوخسارێك گۆڕاوە ..کچەکە سەیر بکەو بزانە چی دۆزەخێکی سەر سەختە ..

ژن:   تۆ تاوان بارێکی سەر سەختی سەیر دەتەوێت ئەو کچەش توشی تاوان بکەیت گومانی تێدا نییە بەو جۆرەش سکی منت پڕ کردوە .

کوڕ: سك ..سك..خانم ..(پەنجەی بۆ درێژ دەکات دەمی دەبەستێت) س..ك..س..

کچ1:   خانم تۆ شێت بویت ؟

کچ2:   بەراستی ئاخرت شەڕ بوە

ژن:   دەبێت کاتی خۆی کچێکی نەشمیل بوبم دڵداریم کرد بێت ئەم سکە نەفرەتیەم مەلی سەرنجی هەڵفڕاندوم ..ئای خواوەند!!

کچ1:   خانم چرچ کەوتۆتە ناوچەوانتەوە.. قەیرەیت..دەچێتە شکەوە چەند سکێکت کرد بێت..ڕەنگە منداڵی گەورەشت هەبێت ..کێ دەڵێت من کچی تۆ نیم ؟!

ژن:   نەهامەتیەکی چەندە سەیرە چاومان بۆتە گوێ و بیستنیش جێگەی زمانی گرتۆتەوە .. بەتەواوەتی سەرمان لێ شێواوە (رو وەردەگێڕێت بەهێواشی دەکەوێتە قسە ) دەبێت خواوەند ئەمەی پێ کردبێتم ؟! تاوانێکە لە دەستی ئەو دێت ..

کچ1:   تەنها خوداوەند ئەوەی لەناوچاوت نوسیوە ..وەکو ئەم سزا توندە ی بە سەر هەموماندا سەپاندویەتی ..

کوڕ:   دەبێت مەلێکی سەرچیا چی گوناهێکی هەبێت؟!

کچ1:   کوڕەکە وەرە بە بەمێردم ..با کەمێك پێکەوە ڕابوێرین ..حەزم لە سەمایەکی دڵفڕێنە

(بەتەنیا سەمایەکی شێتانەی شەهوانی دەکات)

کچ2:  لەوانەیە هاوسەرێکم هەبو بێت؟! ئای لەم بیّ دادیە (ئەڵقەی پەنجەی دەردێنێت) ئەوەتا ئەوە نیشانەکەیەتی ئۆف سزایەکی نارەوایە..:

کچ1:  ئێمە کچۆڵەی شاخ و کێوێکین پڕ لەگولّ و گولّزار بوین ..لەباخچەی پادشایەکی مەزندا ژیاوین ..ئێستا دیلی دێوی نەزانراوین..

کەسمان هەست بەخۆمان ناکەین ..کیّ دەڵێت من پیرە مێردێك نەبوبم ..یاخود کوڕێکی گەنج ..یا کچێکی شۆخ ؟!

کچ1:  ئەم ڕوبەرە هەمو هیوایەکی وشك کردوە ..تەنانەت چۆلەکەیشی پێدا ڕانابورێت ..چریکەی مەلێکی وێڵیش نایەتە بەر گویّ ..

کوڕ:  هیوامان لەسەر کفنێکی سپی دەنیشێتەوە ..ئەویشمان لیّ بۆتە سێبەر ..لێرەدا بمرین گۆڕ هەڵکەندنمان پێویست نابێت ..

کچ1:  ئەو هەوا بۆگەنە جێگەی هەمو شتێك دەگرێتەوە ..بەتەواوی مرۆڤ دەتوێنێتەوە ..ئیتر گۆڕستان و پرسەو ناشتن بەسەر دەچێت

کچ2:  هەتا ئێستا بیرم لەوە نەکردۆتەوە مرۆڤ بمرێت چی لێدەکرێت ؟! کەس بەبەرچاومەوە گیانی نەداوە

(تەزویەکی سارد بەبایەکی شێدارەوە بەناو تاریکستانەکەدا دێت کاراکتەرەکان دەترسن و باوەشی زەلیلی بەیەکدا دەکەن و بەژانی مەرگەوە جیادەبنەوە )

کچ1:  ئەمە ئەو بروسکەیە بو راستی خواوەندێکی ستەم کار دەردەخات ئای لەم گۆڕستانە .. مرۆڤایەتی تیا کراوەتە قەرەبروت..

کچ2:  کێتان تاوانێکی گەورەتان کردوە ؟!

ژن: ئۆف گوناه ..تاوان ..(لەشی دەلەرزێت بەگریانەوە پرچی دەسکەنە دەکات) چەند ستەمە مرۆڤ گومانی لەخۆی نەبێت هەست بەتاوانێکی سەخت بکات ؟(هەردو دەستی دەخاتە سەر سکی )

بەجارێك لەشم تویّ تویّ دەبێت ؟!

کوڕ:  (بەهەر چوار دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوەو هاواردەکات) ئێرە شوێنەواری جەنگێکی گەورەیە پاشماوەی تەنها دوکەڵە ..سەیر چی زۆنگاوێکی پڕ مەترسیە ..

ژن: ئێستا گومانم پەیدا کردوە کە بۆمبای ئەتۆمم بەرکەوتوە ،ئەو ژەهرە گلاّوەی لەشمی داڕزاندوە..

کچ1:  ئەو ژنە بەئەتۆم ئەو منداڵەی هاتۆتە ناو سکەوە کێتان پزیشکی دەزانێت با فریایی بکەوێت؟!

**كچ2: ئەمە پرسيارێكی سەيرە (دەست بەسنگی 1 دا دەكێشێت) تۆ كچە نەشميلەكە پزيشكی نازانيت ؟! ئەم سەدريەی بەرت لەوە دەچێت پزيشك ياخود سستەرێك بوبێتی؟**

**كچ1: بۆ تاقە گوڵێك لێرەدا سەر دەردەكات .. خانم ئێرە ئەتۆمی تيا تاقی كراوەتەوە ..**

**كوڕ: گەلاو چڵ و كۆشك و تەلار و مار و مێرو سەرپاكيان لێرەدا توێنراونەتەوە ..ئای نەهامەتی ..**

**ژن: ژانێكی دەزولەيی بەلەشمدا دێت و پتر دەئاوسێت .. دەبێت ئەو ژەهرەم قوت دابێت**

**(كاراكتەرەكان لەيەكتری دەڕوانن بەگومانێكی شێتانەوە لەجێگەی خۆيان هەڵدەبەزنەوە )**

**كچ1: (رو دەكاتە كچ2 ) خانمی نازدار تۆ لاشەت تەواو تێك چوە گومانی تێدا نييە وەكو ئەو ژنەت بەسەر هاتبێت دەبێت سكت پڕ بوبێت ؟!**

**كوڕ: (سەيری كچ1 دەكات و هەناسەيەك هەڵدەكێشێت) تۆش جوانيەكەت تەواو ژاكاوە ئەو دەردە هەمومانی گرتۆتەوە ؟!**

**كچ1: سەر سنگم بريندار بوە وەكو لەتە گوێزانێكی كول هەڵی دڕيبێت بەو چەشنە دەچوزێتەوە هاكا كوشتمی**

**كچ2: هەناسەكەم وەكو تۆپەڵە قوڕێكی خەستی لیٚ هاتوە .. نازانم چۆن بەسيەكانمدا هاتوچۆ دەكات؟!**

**ژن: كارەساتی وا هەرگيز روی نەداوە ..لەپەستا لەشمان هەڵدەئاوسێت..هەمومان لەساتی مردندا دەژين..**

**كوڕ: نيشانەی ئەو بۆمبەيە..**

**كچ1: تەنانەت ئەم مەرگە ساتەش ئەوە دەردەخات ..سەير چەندە تاڵە ..(لەجێی خۆيدا خول دەخوات) بزانە ماسيەك ..گوڵە گەنمێك..تاقە تروسكەيەك ..تيشكێك ..هەتاوێك ..لەنيگامان دەدات..**

**كچ2: ئەو شارستانيەتەی ئەو بۆمبەی تێدا بتەقێتەوە ..بەو جۆرە دەسوتێت ..كۆشك بالاٚخانەو گژوگيا سەرپاك دەپوكێتەوە..**

**(كاراكتەرەكان بەترسەوە پەلی يەك دەگرن و بەئاوازێكی مەرگاويەوە دەكەونە هەڵپەڕكێيەكی گيان دەرچون).**

**گەلای تەمەن لەبەر هێزی گەردەلولا**

**بۆناو گۆڕی تاريك دەخزێت ..**

**زەنگی مردن دێتە بەرگویٚ..**

مۆمی ژیان خامۆش دەکات .

شەپۆلاوی مەرگەساتە !!

(بەو ئاوازەوە لەیەکتری جیا دەبنەوە هەریەکە بەلایەکدا هەنگاو دەنێت)

کچ1:  مردم گیانم هاتۆتە سەر لوتم ..فریام بکەون ..

کوڕ:  ئای هەردو قاچم چەقیوە ..هێزم نییە بەهیچ لایەکدا بڕۆم..

کچ2:  لەم شەپۆلاوە ترسناکە ..هەنگاوێکی ترم بنایە دەتوامەوە..(پەلی کوڕەکە ڕادەکێشێت) دەی ڕزگارت بو ..خۆشەویستەکەم(ماچێکی دەکات)

ژن:  ئۆف چی قوڕقوشمێکە ؟! خوای تاوانبار (بەهەمو هێزی دەقیژێنێت) سزایەکی چەپەڵە..فەرمانێکی گڵاوە..تف لەسەرکردەی ئەم دۆزەخە ناڕەوایە..

(هەوایەکی سارد دەکشێت ..پاسەوان لەسەر شانۆ ئەفسوناویەکەوە تیشکێکی دەچێتە سەر ..بەبەرگێکی ئەفسانەییەوە نیوەی پانتایی شانۆ داگیر دەکات و وەکو ئامێرێك وەستاوە ..لەگەڵ ڕاکێشانی زنجیری زەنگەکەدا ..تاریکستانەکە دەشڵەقێت ..سەدان شاڵاوی بەهێز دەیگرێتەوە .هەزاران کەللە سەرو موڕەغە دەبارێت و بەشەپۆلەکاندا دێن ودەچن ..کاراکتەرەکان بەترسی مەرگەوە خۆیان حەشار دەدەن، زمانیان لەگۆ دەکەوێت لەگەڵ کپ بونەوەی هێزە توندەکەدا بە لاڵیەوە دەکەونە قسە)

کوڕ:  گۆڕستانەکانی ژیان لێرەدا هەڵدراونەتەوە ..ملیۆنان مردو بە سەرو ڕوماندا پەخش بونەوە ..(تەواو لەشی دەلەرزێت)    ئای لەم سامناکیە دڵمی تەقاند ؟!

کچ1:  ئەمە کارەساتێکی ناکات بو ..بوبە مایەی گوناهێکی چڕ هەرگیز شتی وا تۆقێنەرم  نەدیوە .. جەرگم یەکالا بووەوە (زرنگەیەکی جەرگ بڕ دەکێشێت.. پاسەوان نیوەی لاشەی دەردەکەوێت کڵاو و خودەیەکی ئەفسانەیی لەسەردایەو دەمو چاوی بەتاریکیەکی ئەفسوناوی دیاری دەدات.. لەناو تاریکستانەکەدا بەسەدان جۆر وێنە دەدرێتەوە) .

کچ2:  تۆ بڵێیت مەبەستی چی بێت؟! خوا ..یاخود سەرکردەیەکی خوێن خۆر بێت و بیەوێت سزامان بدات ؟

ژن: ئێمە لەهەمو تاوانێکەوە دورین ..دەبێت بەکام تەرازووەوە سزامان بخرێتە سەر؟!

کوڕ:  تاوان ..سزا..گوناه..هەرسێکیان لەناو بوخچەی تاریکی و لەبیر چونەوە دا شاراونەتەوە ..

**کچ1: (لەسەر سەر دەخولێتەوە و هاوار دەکات) تاوان مەبەستی چییە ؟ تاوان ..ئۆف(سەیری پاسەوان دەکات) رەنگە باسی ڕزگاربونمان بکات ؟ (بەمەستیەکەوە بەرەو شانۆ هەنگاو دەنێت) تاوان گەورەم دەتەوێت ئازادمان بکەیت ؟!(هەرسێ کاراکتەرەکەی تر دوای دەکەون).**

**کوڕ: لەوانەیە بەزەیی پیاماندا بێتەوە ..بەڵکو دەرگاکەمان بۆ بکاتەوە ؟!**

**کچ2: (دەقیژێنێت) سەرکردەی مەزن مەبەستت ڕزگاربونمانە ؟!**

**(پاسەوان دەقیژێنێت ..مۆسیقایەکی جەنگی دڵ تەزێن دەکشێت و تێکەڵی رەشەبایەکی توند دەبێت ..کاراکتەرەکان بەلەرزینەوە باوەش بەیەکتردا دەکەن و لەگەڵ زەنگی مەرگی هەزارەها بێلانەدا بێ هۆش دەکەون )**

## بەشی دووەم:

(ڕوناکی دەچێتە سەر پاسەوان بەبەرگێکی ئەفسوناویەوە تاریکی دای دەپۆشێت و ڕوناکی دەچێتەوە سەر ..لەگەڵ بروسکەی بێدەنگدا شێوەی بەناو تاریکستانەکەدا شەوق دەداتەوە ..دوا تیشك زنجیرەی زەنگەکە رادەکشێت و تاریکایی دەچێتەوە سەر و سەرکردەی سوپایی دێتە سەر شانۆ).

سەرکردە: میوانەکانمان پەشۆکاون ..بەسەر هاتی خۆیان دەگێڕنەوە نازانن ئەوانە لێرەدا قەدەغەن دەیانەوێت چاو لەڕابردوی خۆیان بپۆشن (پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی دەکات) بەو جۆرە وەکو بەبێ یاسا سەیری ئەو شارستانیەتە بکەن (بەتیژی تێدەپەڕێت و لەچاو ون دەبێت ).

(تەوژمێکی تاریك تاریکستانەکە دەگرێتەوە ..کاراکتەرەکان بەحەپەساویەوە باوەش بەیەکدا دەکەن ولەجێی خۆیانەوە هەڵدەبەزنەوە .. لەگەڵ لێدانی مۆسیقایەکی جەنگی هێواشدا دەکەونە قسە).

کوڕ: ئەمە دو خێوی ترسناك و نابینا ..ئای لەو جوتە دڕندانە ، کەس نەیزانی لەکوێوە سەریان هەڵدا؟!

کچ2: ئەمیان بەرگی سەرکردەی پۆشی بو ..پلە و ویسام بەسەر شان و لاملیەوە پەرش ببۆوە شوشە شەرابێکی بەدەستەوە بو..

کچ1: لەگەڵ ئەو دڕندەیەی تردا جیاوازی نەبو.. ئەویش وەکو ئەو ترسناك دەهاتە بەر چاو ..

کوڕ: پێ دەچێت ئەمە سەرکردەی ئەم تاریکیە بێت .. وێنەی خوێن خۆرێکی پیس دیاری دەدات ..

کچ1: گومانی تێدا نەبو پادشایەکی چەوسێنەر بو ..ئێرەش وەکو شوێنەواری سەرکردەیەکی زۆردار دەنوێنێت ..رەنگە ئەو دڕندەیە هۆلاکۆیەکی تازە بوبێت؟!

کچ2 : ئەم جێگەیە شێواوە ..ترشاوە ..هەروەکو مەغۆل جەنگیان تێدا کردبێت ؟

کوڕ : مەغۆل.. مەغۆل.. دەبێت سەربازگەیەکی جەنگی گەورە بێت و پڕ بێت لە جبەخانەو تۆپ و تانك و زرێپۆش و فڕۆکەو ئەستوڵی جەنگی و کەلوپەلی تر؟!

(پاسەوان لەسەر شانۆکەوە قاقایەکی گەورە دەکێشێ و ڕوناکیەکی سامناکی دەچێتەوە سەر)

**ژن: ئەم نەگریسە پاسەوانی ئەو سەرکردە زۆردارەیە..سەیری بکەن لەشی بریسکە دەداتەوە.. من ئارامم لەبەر بڕوە ..تەزوی مەرگاوی بەجەستەمدا دێت لەم ساتەدا هەست دەکەم سکم دەکەوێتە سەر شەپۆل..**

**کوڕ : ئەوە بنەمای سکەکەت ئاشکرا دەکات ..**

**ژن : ئەوە پابەندی کێشەیەکی ترسناکە (دەست بەسەریەوە دەگرێت و لەناخدا خۆی دەخواتەوە).**

**کوڕ : خانم زویر مەبە .. ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بەتاوانەوە نیە.. تۆ ژنێکیت سکت هەیە .**

**ژن : هەرگیز سك گومانێکی بەتاڵە ..خەونێکی زڕە من بەهۆی ئەم شەیتانەوە توشی دڵە ڕاوکێ هاتوم..**

**کچ1: سکی ئەو خانمە پەیوەندی بەهێزە نەزانراوەکانی ئەم دۆزەخەوە هەیە ..رەنگە بەهۆی کارەساتە نەبینەکانەوە سکی پڕ بو بێت؟!**

**کچ2 : دیارە تەقینەوەی بۆمبا زانستیەکان توشیان کردوە..پێستەکەی ژاکاوە ..بەتەواوی رەنگی ئەتۆمی پێوە دیارە ...**

**کوڕ: پریشکی ئەو مادە ژەهراویە بەر هەر خاك و خۆڵ و وڵات و جێگەیەك بکەوێت بەو چەشنەی لیّ بەسەر دێت ...**

**کچ1: دەبێت ئەو بۆمبە لە کیشوەرێکی تردا تەقێنرابێتەوە.. بزانن ناوی وڵاتێکتان دێتەوە یاد؟!**

**ژن: وڵات ئەمەش دیسان گومانێکی سەیر ترە دەبێت ناوی شارێك ..وڵاتێك ..شاخێك .. بێتەوە بیرمان؟**

**(شاڵاوێکی تۆقێنەر دەکشێت ..زەنگێکی تێکەڵاوی سەربازی لێدەدرێت کاراکتەرەکان دەکەونەسەر لەرزی مەرگ ..پاسەوان تیشکی دەچێتە سەرو خامۆش دەبێت سەرکردەی سوپایی بب بەرگی سەربازیەوە دێتە پێشەوە ..شوشە شەرابێکی بە دەستەوەیە قومی لێدەدات)**

**سەرکردە: ئێوە دەزانن ئەم جێگەیە چەند پیرۆزە ..پایتەختی سەرکردەیەکی مەزنە.. شارستانیەتێکی گەورەیە لێرەشدا خەریکی دوپات بونەوەی گوناهەکانتان .**

**(زەنگێکی هێدی دەکشێت کاراکتەرەکان لەیەکتری دەڕوانن ..لەگەڵ زرنگانەوەی زەنگەکەدا دەکونە لەرزێکی خۆکردە کزەیەکی بەهێزیش بەسەرو چاویاندا دێت و مێشکیان دەتەزێنێت).**

**ژن: زیرەی مەرگی پیّ کردم.. ئای چی بەڵایەکی سەرسەختە ..تف لەم نەعلەتیە (بەهەمو هێزی دەقیژێنیّ) تف..تف..بەد ڕەفتار.**

(تەوژمێکی بەهێز دێت تاریکستانەکە دەکەوێتە سەر گێژەڵوکەی مەرگ ..پاسەوان لەسەر شانۆکەوە بەکلاّو خودەیەکی ئەفسانەییەوە دەردەکەوێت و ناڕێکی دەچێتەوە سەرسەرکردە بەهێواشی دێتە سەر شانۆ.لەگەڵ هەنگاوەکانیدا مۆسیقایەکی هێدی لێ دەدرێت..ئەویش قومێك لەشەرابەکەی دەدات وتورەی دەیگرێت)

سەرکردە: دەبێت تاوانبار بخرێتە تای تەرازوی تاوانباریەوە ئێوە هەموتان تاوانبارن ..ئایا دەزانن؟!

کچ2: تاوان (سەیری خۆی دەکات و پەنجە بۆ کوڕکە درێژ دەکات) دەبێت هیچ کام لەئێمە سوسەی تاوانێکی لێ بکرێت؟!

کوڕ: هەڵبەتە ئێمە بەتاوانبارێکی سەرسەخت لەقەڵەم دراوین؟!

کچ1: تاوانی ئەم دەردە کوشندەیەیە ..ئەم مردنەی بەبێ پەساپۆرت سەرسنگی گرتوین...

سەرکردە: تا زوە پێ لەسەر نکۆڵی کردن لابەرن و دان بە راستیەکانتاندا بنێن (خولێك دەخوات و دەستی چەپی بەسەر قەمەکەی قەدیەوە دەگرێت ) ئاوها بێ ئەوەی هێندە زەحمەتی خۆتان بدەن

(قومێك لە شەرابەکە دەدات و بە ئاوازی پیانۆیەکی سەربازیەوە قاچ دەجوڵێنێت و وردە وردە تاریکی سەر دەکەوێت)

کوڕ: تازە بوین بەپاڵەوانی شانۆیەکی نوێ ئەگەر بەم چەشنە لەم تاریکیەدا بێ تروسکە بین ئەوا دەبینە قەرەبروتێکی تەواو ئێسك وپروسکمان نابینرێتەوە.

ژن: مردم خەریکە گیانم دەدەم ..ئیتر دوا ساتی ژیانی پڕ لەدەرد و ئازاری مەرگمە.. ڕیخۆڵەکانم کفە کفیانە ..

کچ1: (هەڵدەبەزێتەوە و هاوار دەکات) لەم خوێن مژە ..چەند دڕندەیە ..جوان سەیری بکەن چی بەد ناوێکە ..ئەم مەرگە موشە تەفر و تونامان دەکات..

(کاراکتەرەکان سەیری پاسەوان دەکەن تیشکێکی بەهێز ڕوناکی دەخاتە سەرو دەکوژێتەوە ..لەنێو تاریکی و روناکیدا لەسەر شانۆکەوە بریسکە بە تاریکستانەکەدا دەهێنێت).

کچ2: چەند ترسناك دێتە بەرچاو.. ئۆف خوایە.

کچ1: کلیلی ئەم نهێنیە لەو شانۆیەوە دەست پێ دەکات ..لەمیشدا کۆتای پێ دێت.

(کاراکتەرەکان دەکەونە چپە چپ و وردە وردە بەهەنگاوی سەختی ئازاراویەوە بەرەو شانۆکە دەچن .. تەزوی ئاگر و قیژە و هاوارێکی تیژ بەجەستەیاندا دێت).

کوڕ: رەنگە بگەینە ترۆپکی هیوا زرەکانمان ..لەوێوە ئەم خەڵوزدانە یەکالاّ دەبێتەوە ..

کچ1: دەبێت بگەینە سەر لوتکەی شانۆ ..ئەو کاتە تروسکەی ڕزگاری دەردەکەوێت .

**ژن:**   **ئازارێکی زۆر شالاوی بۆ هێناوم لەوەدام بەیەکجاری لەشم دابوەشێت (هاوار دەکات) ئای بۆ ئازادی چەند ستەمە ئەم ژیانە گلاوە ..کوا چرای شادی؟!**

**کچ1:**   **ئۆف لەم مێردەزمەیە ..قورگم گیراوە (پژمەیەکی بەهێز دەکات و لەجێی خۆیدا وشك هەڵدێت .**

**(زەنگێکی تیژ دەکشێت و پاسەوان ون دەبێت .. بەهەزاران کەللە سەرو مۆرەغە بەسەر کاراکتەرەکاندا دەبارێت و ئێسك و پروسك و مۆرەغە بەرز دەبنەوەو دادەبەزن ..  کاراکتەرەکان بەبێ هۆشی ترسی مردنەوە دەگەڕێنەوە)**

**کوڕ:**  **ئۆف..(بەهەناسە برکێوە شەل و گێڕ دەڕوات و قسە دەکات) هەمو شتێکمان لێ تەلبەند بوە ..دەستمان بەستراوە ..بەم چەشنە بڕوات مەحاڵە ڕزگار بون لەم دڕندەیە..**

**کچ1:**   **لەم تاریکیەدا وێنەی ژیانمان بەتێك شکاوی دەخرێتەوە بەرچاو وەك لەژێر زنجیری خوایەکی تۆڵە سێندا بین..**

**ژن:**   **خوا..خوا .. تەنها پەڵپی لە ئێمە گرتوە ..وەکو جەجاڵ بین..یاخود جیهانمان خاپور کردبێت ؟!**

**کوڕ:**   **فریشتەکانیش لەگۆشە نیگای ئەم زاتە سەختەوە تۆڵەی تاوانە نەبینراوەکانمان لێدەکەنەوە ..**

**کچ2:**   **ستەمە ژیان ..تاوانە مرۆڤ .. لەئاگردانێکی وا بێ ناسنامەدا ژیان گوناهە...**

**کچ1:**   **دەبێت مەرگ هەڵبژێرین هەتا دەگەینە ڕزگاری؟!**

**ژن:**   **لێرەدا دەبین بەسوتوی خۆڵەمێش (دەست بۆ تاریکیەکە درێژ دەکات) سەیر چۆن شەپۆل دەدات؟! لەوە دەچێت ببینە بەشێك لەو هەوا بۆگەنە؟**

**کچ1:**   **من حەزم لەمەرگە ..ئارەزوی گیان دەرچون دەکەم؟!**

**کوڕ:**   **کەستان حەشیشەتان نەکێشاوە؟!**

**کچ1:**   **ئای کەحەزم لەکێشانیەتی ئەم کونەدێوە تەنها بەتلیاك کۆتایی پێ دێت..**

**کچ2:**   **تۆ ڕەنگت ئاوەژو بوە ..وەکو تلیاك خۆرێکی کۆن دیاری دەدەیت ..(دەست دەخاتە سەر شانی)  دەزانیت تلیاك ڕەنگی چۆنە.**

**کچ1:**   **تلیاك ..ئەمەش پرسیارێکی بێ ناوەڕۆکە بێ مانایە تلیاك ڕەنگی نییە ..**

**کوڕ:**   **دەبێت هەمومان بەتلیاکێکی کۆنە بێ هۆش کرابێتین؟!**

**ژن:**   **من نەگبەتێکم توانای جگەرە کێشانم نیە .. ئەگەر تلیاکم دەست بکەوێت ناوێرم سەیری بکەم.**

**کچ2:** گیرفانتان بگەڕێن بزانن پاکەت و شقارتەتان پیٚ نییە ؟

(کاراکتەرەکان گیرفانیان دەپشکنن)

**کوڕ:** تاقە شتێکمان لەباخەڵدا نییە ...

**کچ1:** تەنانەت ئاوێنەیەکیش چەند حەز دەکەم سەیری خۆم بکەم .

**کچ2:** دزەکانی ئەم کاولەیە لەشمان گەڕاون ..تالاٚنیان کردوین.

**ژن:** نەهامەتی وا هەرگیز نەبینراوە ..تەنانەت ملوانکەیەکیشمان لەملدا نییە ..

(کور بەچوار دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو هەلەکە سەما دەکاتشەپۆلەکە گڕی لیٚ دەبێتەوە ...دیارە ژیان کۆتایی پیٚ دێت ..)

**ژن:** ئاخ لەم بەندیخانە بیٚ دەروازەیە (بەئازارەوە ڕادەکشێت) هۆشم بەخۆم نەماوە ..هەمو شتێکم لیٚ بوەتە پلێتەیەکی دوکەلاٚوی ..(کاراکتەرەکان لە دەوری خڕ دەبنەوە)

**کچ1:** خانم ئەمە پەیوەندی بە گوناهێکی نەزانراوەوە هەیە.

**کچ2:** پابەندی ئەو ترسەیە کەئێمەی گرتۆتەوە ...نازانم چراکانی ژیان لەکوێوە دەست پیٚ دەکات..

**کوڕ:** ئەم خانمە ترسێکی گەورە چۆتە لەشیەوە ..ئەوەش ئەم کارەساتەی پیٚ خوڵقاندوە ...

**ژن:** ئەمە گوناهێکی شاراوەیە تاوانێکە لەناو بیٚ تاوانیەوە ..من بیر لەهیچ کارەساتێك ناکەمەوە ..جگە لەئەفسانەی مۆمیا کراوی ئەودۆزەخە هەست بەهیچی تر ناکەم..ئەوەش ڕەوڕەوەی بیٚ گوناهیمان دیاری دەکات..

**کوڕ:** هەرگیز ڕوخساری خۆمم نەدیوە

(بەرز دەبێتەوەو پەلی کچ1 رادەکێشێت) ..

ئازیز سەیرم بکە بزانە جوانم ؟! (کچ1 بەدوایدا کێش دەبێت )

گەنجێکی هەژدە ساڵاٚن ..پێدەچێت بگەیتە پەنجاش لەوانەیە سەدیش ببی؟!

**ژن:** (سەری بەرز دەکاتەوە ) دو سەد ساڵ دەبێت (سەری دادەنوێنێتەوە تاریکی دەچێتەوە سەر)

**کوڕ:** چوار سەدە ..هەژدە (پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی دەکات) لە چرکەیەکەوە هەتا سیٚ سەد ساڵ دیاری نییە من تەمەنم دەخولێتەوە..ئێوەش بە هەمان چەشن کەس نییە بتوانێت تەمەنی ئێمە بزانێت.

**کچ2:** هەمو شتێك شێواوە ..کێشانەو پێوانە.. کات و شوێن ..سەرپاکی جیهان بوە بە حەشیشە کێش .

**کوڕ:** چەندە ،خۆش بو لێرە حەشیشەمان بکێشایە؟

**کچ1: ئەم جیهانە جەنجاڵە ئەویشی سوتاندوە ..**

**کچ2: ڕەنگە سەدان کێڵگەی تلیاکی تێدا خاپور کرابێت؟!**

**کوڕ: دەبێت ئێرە شوێنەواری تلیاکی سوتاو بێت؟!**

**کچ1: سەراپای ئەم ڕوبەرە تۆوی تلیاك و حەشیشە بوە ..سەرکردەکانی جەنگ بە ناپڵمیٚ ئەتۆم کاولیان کردوە .**

**کوڕ: (پەلی کچ1 دەگرێت) وەرە کچە نازدارەکە با جوان دەست بخەمە ملتەوە ..وەرە شۆخی ئەم دۆزەخە..**

**کچ1: خۆشەویستەکەم (باوەشی پیا دەکات) عەشقی تۆم کەوتۆتە سەر، ئۆف چەندەم حەز لێتە..(ماچێکی دەکات و بەخۆیەوە دەنوسێنێت) ئۆخەی..**

**(بۆگەناوێکی ژەهراوی بەتاریکستانەکەدا دەکشێت. سەرپاك کاراکتەرەکان گێژ دەبن و لە یەکتری نزیك دەبنەوە)**

**کچ2: دەردێکی خۆکرد جەستەمی گرتۆتەوە ..ئێستا هەست بەشریخەی گیان دەرچون دەکەم..**

**ژن: جەرگم بەدەم ئازارێکی زۆرەوە ریشەکێش دەبێت ..لەوەدام سەری بیٚ هۆشی بخەمە کۆشی مردنەوە .(دەقیژێنێت و چەپۆکێك بە سنگدا دەکێشێت) چی سامناکیەك هاتۆتە سەرمان لەوانەیە بکرێینە کەفی تواوەی کورە ؟!**

**کچ1: خانم ڕاست بەرەوە ..دانیشە بەڵکو لە لاوە ئەو سکەت ئاشکرا بێت (دەست دەخاتە ژێر سەری بەرز دەبێتەوە)**

**ژن: سك (لەخۆی وردەبێتەوە) ئەمەمانای گومانێکی ناڕەوایە..کەس هەست بەمە دەکات؟ ئەژدیهایەکی ترسناکم لەسکدا بێت.**

**کچ2: تەواو سکت بەرزە ..نیشانەی نۆ مانگانەی پێوە دیارە.**

**ژن: هەرگیز ..ئەوەتاوانێکی سەختە..لەکوێوە سکم پڕ بوە ؟ دەبێت گەرداوی ئەم ئەفسانەیە بەر چاوتانی گۆڕیبێت ؟!**

**(تەزوی ئاگر بەلەشیدا دێت و هاوار دەکات) ئۆف..ئۆف..مردم گیانم هاتەدەر(رادەکشێت)**

**کچ 2 : خانم ئەمەش مایەی شکە ئەوەتا لەتاو ئازار لەشت یەکالاٚ دەبێتەوە هاکا..هاکا.. بەچکەکەت دەرکەوت.**

**(ژن هەردو دەستی بەسکیەوە دەگرێت و تەواو قاچی درێژ دەکات و دەناڵێنیٚ و دەکەوێتە هێڵنج دان)**

ژن : تەنها ژەهر چۆتە ناو سکمەوە ..ریخۆڵەکانم تالأییان پیادا دەڕوات.

کچ2: سەیر بکە چیت لیّ هاتوە ؟! (دادەنەویّتەوە) دەتەویّت دەست بە سکتدا بهیّنم!!

ژن: ئای چی ژانێکە ؟! وا مردم چرکەیەکی دی دەتەقمەوە (بەهەمو هێزی دەقیژێنێت)

تف..تف..تاوان باران ..(سەرکردە لەلای چەپی شانۆوە خۆی دەردەخات)

سەرکردە: زەنگ ..زەنگ ..

(دەیان زەنگۆڵەی جۆراو جۆر دەنگ دەداتەوە. تاریکستانەکە دەلەرزێنێتەوە ..کاراکتەرەکان لەجێی خۆیاندا لاڵ وپاڵ دەکەون.. سەرکردەی سوپایی بەبەرگی سەربازیەوە دێتە سەر شانۆ.. تەنها قەمەیەکی بەقەدەوەیەو شوشە شەرابێکی بەدەستەوەیە قومی لیّ دەدات ..... مۆسیقایەکی سەربازی لەگەڵ هەنگاوەکاندا لیّ دەدرێت ..لەگەڵ زرمەی پۆستاڵەکانی پیّ ی دا ئاوێتە دەبێت ).

ئەوانەی بەبیّ ترس خۆتان بەم جیهانەی مندا کردوە ..پێویستە سزا بدرێن.(سەیری کچ1 دەکات) هەستەوە دەڵێی مەستیت؟!(کاراکتەرەکان دەحەپەسێن و بەلەرزەوە سەیری سەرکردە دەکەن .. ئەویش بەسەریاندا دەنەڕێنێت) دەی راست بنەوە ..بزانم چی دەردێکتانە؟!

کچ1: (هەڵدەسێتەوە) دەبێت مەست بوبێتین ؟! رەنگە عارەقمان خواردبێتەوە ..ئای لەم تاوانە؟!

کچ2: هەمو شتێك لێرەدا مایەی گومانە (راست دەبێتەوە) وەکو ئێمە توشی کارەساتێکی وا سەخت بوبین .شتەکانی تریش بەو جۆرە دروست دەبن ..

سەرکردە: (چەپۆکێك بە کچ2 دەکێشێت) تۆ چەند ناشرینیت ..چەندە تاوان باریت ..ئایا دزیت ، چی گوناهێکت هەیەو چیت کەوتۆتە ئەستۆ ؟!

(کچ 2 سەیری خۆی دەکات و واقی وڕ دەمێنێت. سەرکردە چەمۆڵەیەکی تری لێدەدات و رو دەکاتە کوڕەکە)

سەرکردە: تۆ ناوت چییە ؟ بزانم دەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە ؟!

کوڕ: ئێمە ناومان نییە ..هەمو شتێکمان بزر کردوە (بە حەپەساویەوە سەیری سەرکردە دەکات) شك نابەم ناوێکم هەبو بێت ؟! ناو ..نا..و.

سەرکردە: دەبێت ناوی خۆت بدۆزیتەوە (بەسەریا دەنەڕێنیّ) ئەمە تاوانێکە هەرگیز لیّ خۆشبونی نییە .

کچ1: چەندە جێگەی سەرسوڕمانە نازانین لە کوێدا دەژین جگە لەم ساتە نەگریسە تاقە یادێکمان نییە.

سەرکردە: بە ژمارە ناوتان دیاری کراوە (دەنگ بەرز دەکاتەوە) تا زوە ناوی خۆتان بڵێن ..

**کچ2:**   دەبێت من ناوم مردن بێت ؟!

**کچ1:**   هەرچی دەکەم ناوێ بۆ خۆم نادۆزمەوە..

**ژن:**   کەسمان ناومان نیە (دەستی بە سکیەوە دەگرێت و هاوار دەکات) ئای خواوەند ،ئەم بۆگەناوە.. چ بەڵایەکە ؟! تف لەم یاسایە ..

**سەرکردە:**   کەواتە سزایەکی توندتان پێویستە .. دوای ئەوە هەمو شتێکتان بیر دەکەوێتەوە .

**کوڕ:**   هیچمان نایەتەوە یاد .. تەنانەت نازانین سزا چییە ؟1 سزا مانای چی دەبەخشێت ؟ (سەیری کاراکتەرەکان دەکات)

**کچ1:**   دەبێت فریشتەی پیرۆز بیرەوەری لە مێشکماندا ڕەواندبێتەوە ؟!

**کچ2:**   تورەیە نارەواکانی خواوەند لێرەوە سەرچاوە دەگرن . لەم دەردە بێ دەرمانەوە دەتەقێنەوە .. لەم یاسا داسەپیوەوە.. دیارە ئەویش لەگەڵ ستەم کاراندا دەستی تێکەڵاوە..

**سەرکردە:**   ئێوە دەستی تاوانێکی گەورەن .. بە جۆرێك لەناو شەپۆلەکاندا سەردەرناکەن .. ئەوەی ڕاستی گوناهەکانتان دەردەخات .

(کاراکتەرەکان ورتە ورتێك دەکەن و لەرز دەیان گرێت)  تاوان.. سزا..ئای ئای؟! (سەرکردە لەشی دەکەوێتە لەرزین .. گورج قومێك لە شەرابەکەی دەدات .. بەتورەییەوە دەکەوێتە قسە)   ئەم مەستیەتان تەنها شێتانەیە .. ئێوە مەستی شەرابێکی ترسناکن ..

**ژن:** دەسەڵاتی قەرە قوشە .. (دەناڵێنێ و ڕو دەکاتە سەرکردە) ئەم تاوانە بێ مانایە چی یە

سەرکردە (دەقیژێنێت)

**سەرکردە:**   خانمەکە چۆن سکت پڕ بو ؟! ئەوە دیسان سزایەکی ترە .

(ژن قژی دەرنێتەوە لە شەپۆلێکی گەورەدا نوقم دەبێت)

**کوڕ:** گوناهەکانمان لەناو گەردەلولی لەبیر چونەوەدا بزر بون ..

**ژن:**   گوناە ؟! مانای چی دەگرێتەوە ؟!

**سەرکردە:**  واتای ئەو تاوانەی منداڵێکت لە سکدایە..(ژن چرو چاوی بەیەکدا دەداو بەتوندی دەقیژێنێت) مەحاڵە ئەو تاوانە بێ فەرە..

هەرگیز .. ئەمە مایەی سزای بێ دادگایە .. من ..من (دەنگی تێکەڵاو دەبێت) سکم بۆ پڕ بوە ؟!

**سەرکردە:**   لە خۆت بپرسە .. (قژی ڕادەکێشێت و فرێی دەداتەوە ئەولاوە) بۆگەن تۆ تاوانێکی سەختت کەوتۆتە ئەستۆ ..

**ژن: دەمەوێت خۆم بکوژم .. کێ نەشتەرێکی پێیە ؟ پەتێکم دەست بکەوتایە خۆم پێ دەخنکاند با ڕزگارم بێت (بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە و هاوار دەکات کاراکتەرەکان بەجێ دەهێڵێت .. چەند هەنگاوێك دەڕوات گیانی وشك هەڵدێت لە تاوا دەقریشکێنێت) دەمەوێت بمرم .. بمرم .. ئاخ .. ئاخ ..**

**کچ1: (بەپەلە دەچێت دەستی دەگرێت ڕایدەکێشێتە دەرەوە) خانم ڕزگارت بو.. هێندەی نەما بو بمرێت؟!**

**(ژن بە هەناسە بڕکێوە زمانی دەبەسترێت و دێتەوە ناو کاراکتەرەکان بێ دەنگ دەبێت)**

**کچ1: دەبێت شەرابمان خواردبێتەوە ؟ (دەخولێتەوە) سەیری تۆ بڵێیت مەستێکی چەند ڕۆژە نەبین ؟!**

**کوڕ: گوناهێکمان خراوەتە سەر مانای لەبیر چونەوەی ڕاستییە ئەزەلیەکانە ..**

**ژن: ئێمە مرۆڤ نین .. دەبێت جانەوەر بین .. مانای گوناهمان نیە .. سەرکردە بێ تاوانین بەسیەتی لەوە زیاتر لەم ئەفسانە بۆگەنەدا تالآومان مەدەرێ .**

**کوڕ: شێوەی مرۆڤمان لێ نابینرێتەوە .. تەنانەت لە ئاژەڵیش ناچین دەبێت زیندەوەرێکی بێ شوێنەوار بین ؟!**

**(سەرکردە توڕەیی دەیگرێت دەقیژێنێت .. تاریکستانەکە شەپۆلێکی بەهێز دەیگرێتەوە .**

**کاراکتەرەکان دەکەونە سەر لەرزێکی مەرگاوی)**

**سەرکردە: تاوانەکانتان لە لاشەتان قورسترە ..**

**کچ 1: دەبێت لە جیهانێکی تردا تاوانبار کرابێتین ؟!**

**کچ 2: من نازانم تاوان چی یە؟!**

**کوڕ: تەنها وشەیەکی پڕو پوچەو هیچی تر .**

**ژن: دەزوی مەرگ دەکشێنێت (هەڵدەبەزێتەوە) ئەم جەللاد خانەیە .. ئۆف دەستم ناگاتە خوایەکی دڕەندە .**

**سەرکردە: ئەو ژنە قیرسیچمەیە .. چەند تاوان بارە .. دەیەوێت قسەش لەگەڵ خواوەند بکات ..**

**ژن: ئەمە بەتەنها بوختانێکی دروست کراوە ..**

**کچ2: کێشەیەکی ترە .. تایبەتمەندە بە بێ تاوانیمانەوە .. پەیوەندی بەو قورساییەوە هەیە کە بە خۆڕایی خراوەتە سەرمان .. وەکو ئەم مەرگە .**

**کچ1: له بەندیخانەی وادا مرۆڤ توشی هەمو شتێك دەبێت .. ئێمە چاوەڕوانی مەرگ دەکەین (هاوار دەکات) مردن لەکوێیت ؟! ئیدی تاوانی چی ؟**

**سەرکردە: دەتانەوێت پاکانەیەکی بێ هودە بکەن .. یاخود پەڕۆی چاوبەستە بە بەرچاوی مندا بهێنن .. بێگومان ئێوە بەوەش تاوانبارن (بە سەریاندا دەقیژێنێت) (شاڵاوێکی تاریك دەکشێت .. لەچکێکی سپی دێتە ناو کاراکتەرەکانەوە کچ1 دەیگرێتەوە)**

**کچ1: سەرکردە ئەوە یادگاری کچێکی نازدارە . دەبێت تۆ کوشتبێتت ؟!**

**ژن: گومانی تێدا نیە ..**

**کچ1: (وێنەکە لە گیرفانیدا دەردەهێنێت) ئەو کوڕە شۆخە سەرکردە جوان دیقەتی بدە ..**

**(سەرکردە پەلاماری وێنەکە دەدات و کچ 2 لە بەردەمیدا ڕادەکات)**

**سەرکردە: سۆزانی ئەمەش سەرپێچی کردن ، مانای تاوان .**

**کچ1: سەرکردە ئەم لەچکە وێنەی نەوبوکێکی نوێیە ڕاست بڵێ لە سەروقژی چ نازدارێکەوە ئاڵابو ؟!**

**ژن: ئەویش کچێکی جوانە مەرگە .. شازادەیەکی وەکو تۆیە (سەیری کچ1 دەکات) دەبێت دەستە خوشکێکی تۆ بوبێت ؟!**

**کوڕ: دەبێت کچێکی چەند نەشمیلە بو بێت .. ئۆف ئەو ڕەنگە تەنها کچە نازدارەکان دەیپۆشن . ئەوە ڕەنگی بالیبە خانەکانە ..**

**کچ2: تەواوی کچە شۆخەکانی باخچەی ژین بۆ ئەم دۆزەخە هاتون.. ئەم سەرکردە دڕندەیە خوێنەکەیان دەمژێت**

**(سەرکردە بەبێ دەنگی لێیان دەڕوانێت)**

**کچ1: سەیربکەن (لەچکەکە بە حەواوە دەگرێت) بزانن قوماشێکی چەند گران بەهایە .. بێ شك ئەمە شوێنەواری خانمێکی خاوەن شکۆیە ..**

**(سەرکردە لەشی دەکەوێتە لەرزین .. بەپەلە شەرابەکە بۆ دەمی دەبات . پاشان بەسەر و چاوی کاراکتەرەکاندا هەڵیدەپرژێنێت .. هەمویان دەکەونە لەرزێکی دەستکرد ئەوسا وێنەکە دەفڕێنێت و لەچکەکەش ڕادەکێشێت و هاوار دەکات) زەنگ .. زەنگ . ...**

**(زەنگێکی تێکەڵاو بەناو تاریکیەکەدا دێت کاراکتەرەکان لەهۆش خۆیان دەچن).**

## بــەشـــی ســێیــەم:

(هاژەیەکی بەهێز دەکشێت .. کاراکتەرەکان ڕادەپەڕن ژن لەگەڵ زریکەی لەخەو ڕاچەنیندا ڕاست دەبێتەوە)

ژن: ئای لەو خەونەی دیتم .. لەم بەندیخانە کۆتاییەدا ڕوداوێکی سەر سەخت ڕودەدات .

کچ1: ترسناکی تەنها ئەم مێردەزمەیە .. هەرگیز ڕزگار بونمان لێی نییە .. وەك دەوار دەوری تەنیوین .. مەگەر چارەسەرێك بدۆزینەوە .. (دەچێتە لای ژنەکەوە) ڕیگایەك بۆ تێکشکاندنی ئەم تەلیسمە ..

کوڕ: بە ئەفسانەیەکی شێتانە مەستی کردوین .. سەیر چی لێ بەسەر هێناوین .. ئۆف لەشم کەوتۆتە سەر چەقۆی مەرگ .

کچ2: هەست دەکەم خێوێك هاتۆتە سەر سنگم و هەمو شتێکی لەبیر بردومەتەوە ..

کوڕ: کێتان سەرگوزشتەیەکتان دێتەوە بیر .؟!

کچ2: چرکەکانی پێش خۆمم لەبیر دەچێتەوە .. دەبێت لاپەڕەی تەمەنمان خرابێتە ناو تەنورەوە ؟!

ژن: ئوف لەم خەونەم زۆر ترسناك بو .. ئای بۆ ڕزگاری . چرای ئازادی پریشك بدات ؟!

کچ2: ئەو خانمە خەونی دیتوە .. بزانن چی یە ؟

کوڕ: بەڵکو لەڕێگەی خەوەوە ساتەکانی ژیانمان بیر بکەوێتەوە ڕەنگە ڕێگایەکی چاك بێت ؟

کچ1: دەی خانم خەونەکەت بگێڕەوە .

ژن: خەونێکم دی (دەستی بەسەر و چاوییەوە دەگرێت) ئۆف .. ئۆف .. (دەقیژێنێت)

(کاراکتەرەکان لە دەوری ژنەکە کۆ دەبنەوە) ئەم خەونەت چۆن بو بۆمان باس بکە ؟

**ژن: (سەری بەرز دەکاتەوە بێ دەنگ لە نیگایەکی تاریك دەڕوانێت.. چەند هەنگاوێك دەچێتە پێشەوە .. بە ئەسپایی قسە دەکات) ئای لەو منداڵە بەجەرگە چۆن هاتبوە کۆشمەوە ؟ شمشێرێکی ئەڵماسی بە دەستەوە بو .. ئەویش ئەفسانەیی بو .. شتی وا ناچێتە ئەقڵەوە (وەردەچەرخێت) ڕەنگە ڕزگارمان بکات ؟!**

**کچ1: ئەو خەونە زۆر زۆر گرنگە .. وەکو پەیام وایە (ژن ڕادەچڵەکێت و بە هێواشی دێتەوە جێگای خۆی) نا .. نا من تەنها وشەیەکم نەگوتوە .. هەتا وەکو گوێ لە قسەم بگرن (دەشڵەژێت) تەنها خەونێکم دیتوە ..**

**کچ2: کەستان خەونامەتان نەخوێندۆتەوە ؟!**

**کوڕ: ئەویش سەر بەکتێبە ئایینیەکانە ..**

**ژن: خەون بە خەونامە لێك نادرێتەوە .. تەنها ئەقڵ دەبێتە بیردۆزی ..**

**کچ1: هەمو ڕێگایەك داخراوە .. ئەم تاریکستانە پڕە لەتاوانی سەخت (دەستی بۆ ناو تاریکیەکە درێژ دەکات) سەیری ئەو تاریکیە وەکو دەمی شمشێر شەپۆل دەدات ؟!**

**کچ 2: لێرە بەدواوە جیهان کۆتایی دێت .**

**کچ1: کیشوەرێکی نەزانراوە .. جیهانێکی بێ نەخشەیە ..**

**کوڕ: ژیانمان لێ بوە بە خەوێکی زڕ .. هەمو ڕێگایەکیشمان بزر کردوە ..**

**کچ1: ئەگەر نەخشەی باکوری زەویمان لەلا بوایە ئەم ئەم جێگەیەمان دەدۆزییەوە ؟!**

**کچ2: هیچ زانستێك ئێرە دیاری ناکات .. هەرگیز لە کتێبە ئایینەکانیشدا باسی نەکراوە .**

**کوڕ: ئێرە گەردونێکە لەدوای گەردونەوە ..**

**ژن: هاوکێشەکان لەخانەی خۆیان ترازاون .. تەنانەت چاو و زمان و گوێچکەش .. من هەمویانم لێ گۆڕاوە ..**

**کچ2: هەست بەتام و بۆن و ڕەنگ ناکەم ؟؟**

**کوڕ: مادەیەك دەبینێتەوە هەتا وەکو بۆنی بکەیت ؟!**

**کچ1: زۆنگاوی ئەم مەرگە نەفرەت لێکراوە تەنها بۆنی لاشەی ڕزیوە ..**

**کچ2: بۆنی دڕکەزی و گوڵی ژاکاوی بەر زەڕەو ئەتۆم ..**

**کوڕ: لە هەمو بون و بونەوەر و مادەیەك تەنها ئێمە ماوینەتەوە .. ئیدی تاقە خونچەیەکی ڕزیویش نابینرێتەوە ؟**

**کچ1: ڕەنگە خرابینە ناو کەشتی سەر مانگەوە ؟!**

کوڕ: سەراپا توشی مەرگی ناکات بوین .. لە ئان و ساتی سەربڕینێکداین .. ناتوانین تاقە بڕیارێك دەربکەین .

ژن: ئەمە لێکۆڵینەوەی مەسەلەیەکی وا ئاڵۆزە بەردی بناغەی کێشەیەکی ترسناکە .. هەر وەکو ئەو ئاوازە کوشندەیەی تاڵاوی مردنی داوەتێ .. تف لەم ئەفسانەیە (سەیری سکی خۆی دەکات و هێڵنج دەداتەوە)

کچ1: هەمو پەیمانێك لەگەڵ خۆیدا هەڵدەوەشێتەوە .. هیچ وشەیەکمان نییە چرکەیەك خاوەنی بین .. لەگەڵ لە دەم دێتە دەر دەمرن ..

کچ 2: ئەمە ڕاستیەکە فەرامۆش ناکرێت ..

کوڕ: هەمو وەك شێتێکی پێ پەتی ڕەنگ دەدەینەوە ؟ لە ساتێکدا لاسایی هەمو تەمەنێکی جۆرا و جۆر دەکەینەوە ؟

کچ1: شێتێتی ئەنجامێکە خۆشە .. بریا توشی ئەوە بوبێتین .. من زۆر حەزدەکەم ببمە شێتێکی گەڕیدە منداڵ بەرد بارانم بکەن ..

ژن: ئەنجامەکانی شێتخانە بەم چەشنە نییە .. لێرەدا کارەساتەکان ئاڵۆزن .. بێ ئەنجام دێنە بەر چاو .. مرۆڤ کوێر و کەڕ و لاڵ دەبێت هۆشی بەخۆی نامێنێت .. وەکو ئەم سکە دوا بڕاوەی من .. ئای توشی چ سزایەك هاتوم ؟ (بەتوندی قژی خۆی ڕادەکێشێت) وا بورامەوە .. کوا مردن ؟ ئێستا پڕ بەدڵ حەز بە گیان دەرچون دەکەم ..

کوڕ: ئەم شەپۆلانە سەرەنجامی شالاوە تۆقێنەرەکانی مێشکە پابەندی شۆرینەوەی بزرکردنی هۆشە !؟

کچ1: (لەسەر یەك قاچ دەخولێتەوە) ئەوەتا من هاریم توش هات ..

کچ2: هاری دەردێکی ئاسانە چونکە بە کوشتن کۆتایە پێ دێت .. بەلاّم چارەی ئەم دەردە بەچی دەکرێت ؟

کوڕ : ناخەکانی دەرونمان وەکو نوشتە لە موشەمای مێو گیراوە .. خوێندنەوەشی قەدەغەیە .. پرسیارێك لە دوای پرسیارەوە .!

کچ2: ئۆف چۆن گرێژنەی ئەقڵ چۆتە ناو سکەوە ڕیخۆڵەکانیش هاتونەتە ناو مێشکەوە ..

ژن: بەڵێ هەر وەکو هەرەس هێنانی دەماغی من بۆ ناو سکم .. ڕاستە ئەم سکەم لە ئەنجامی ئەو لیتەیەیە .

کچ1: دەمەوێت خۆم بخنکێنم .. کێتان پەتێکتان پێیە ؟ با خۆم بکوژم و ڕزگارم بێت .

کوڕ:   ڕزگاری لەوەشدا نییە کچە جوانەکە .. ئازیز پاپەندێکی تری هەیە .

(گەردەلولێکی بەهێز دێت .. پاسەوان لەسەر شانۆ ئەفسانەییەکەوە وەکو خەواڵویەك نیوەی لەشی دەردەکەوێت .. پەنجەی بە تەختەی شانۆکەدا دەکێشێت .. زرنگاندنەوەی دەنگێکی بەهێز تاریکیەکە دەگرێتەوە . کاراکتەرەکان بە داچڵەکینەوە سەیر دەکەن)

کچ 2 :   ئەوە دەروازەی ڕزگار بونە .. سەیرە هەروەکو تۆپیبێت .. بڕوانن خەواڵو دیارە .

(کاراکتەرەکان بەسەمایەکی نیوە گیانیەوە لەیەك دەڕوانن و بەرە و شانۆ ئەفسانەییەکە دەچن)

ژیانێکی تاریك و لێڵ ..

کەتوینەتە ناو ئەفسانەی خوای کوشتار کەر..

کاروانی مەرگ بەڕێوەیە..

هەزارەها .. ملیۆنەها ..

لە دۆزەخی گڕاویدا بون بە دوکەڵ   ...

ترسناکە ئەم ژیانە مەرگاویە  ..

ڕێگە دەبڕین ...بەژێر باڵی گیان کێشاندا !!

(لەسەر شانۆکەوە بە سەدان قەپاڵی زل دەم دەکاتەوە .. هاژەو قیژەیەکی گەورە و هاواری هەزاران دڕندە و گیاندار و مرۆڤ بە تێکەڵاوی دەکشێت .. کەللە سەرو مۆرغەو ئێسك و پروسك وەکو شەنی خەرمان بە هەمو لایەکدا دەبارێت .. پاسەوان سەر دەردێنێت و پەتی زەنگەکە ڕادەکێشێت .. کاراکتەرەکان زمانیان لە گۆ دەکەوێت .. لەگەڵ نیشتنەوەی شەپۆلەکاندا سەیری پاسەوان دەکەن)

پاسەوان: ئەها .. ها .. ها .. ه .. ا ..

کچ1:  دەبێت ئەمەش ناوبنرێت تاوان ؟ تف .. دڕندە ..

کچ2:   وشەیەکی لەدەم دەرنایەت .. تەنها پێ دەکەنێت (ڕو دەکاتە پاسەوان) دەی قسە بکە ؟ ئێمە دەمانەوێت خۆمان بناسینەوە .

پاسەوان:    ئەها .. ها .. ها .. (تیشکێکی سەر دەکەوێت و دەکوژێتەوە)

کوڕ:   ئەمەش بیانویەکی ناڕەوایە .. پەلپێکی پیس و فێڵاوییە .. (ڕو دەکاتە پاسەوان) وەڵاممان بدەرەوە .. باڕزگارمان بێت ؟!

ژن:   لەم دۆزەخەدا بوینەتە بەچکە پشیلە .. (قیژەیەکی توند دەکات) تاوانبار ئازادمان بکە .. بەسە ئیتر کاتی سەرفرازییە ؟!

(پاسەوان دەقیژێنێت و زنجیری زەنگەکە ڕادەکێشێت..زرینگەی زەنگۆڵە لە هەمو تاریکستانەکەدا دەنگ دەداتەوە و کاراکتەرەکان فڕێ دەدرێنە جێگەی خۆیان)

کچ1: چی سامناکیەك بو زیڕەی مەرگی پێ کردم ؟

کوڕ: دەنگی وا بەهێزم نەهاتۆتە بەرگوێ .. هەرگیز تەنانەت دڕندەش بەو چەشنە نییە؟!

ژن: سکم کەوتۆتە سەر ژانێکی کوشندە .. جەستەم شی دەبێتەوە (هاوار دەکات) ئای خوایە ؟

کچ1: بروسکەی خواوەندێکی سەخت بو .. هەمومانی خستە ناو شەپۆلێکی نەزانراوەوە ..

کوڕ: زەنگی پادشایەکی تۆقێنەر بو .

کچ2: شاڵاوێکی هێندە بەهێز بو هەمومانی لول دا دەڵێی کەوتوینەتە ناو گۆمی گێژاوەوە ؟!

کچ1: ڕنگە زەنگی ڕۆژی حەشر بوبێت ؟

ژن: ئەو زەنگە ناکاتیە بو کە چاوەڕوان ناکرێت (بە ئازارەوە ڕادەکشێت) ئای مردم .

(کوڕ ڕو دەکاتە کچ1) کچی شۆخ تۆ مامانی نازانیت ؟!

کچ1: مامان .. ئەمەش پیشەیەکی خۆشە ..

کچ2: ڕەنگە کاتی خۆی کچە مامانێکی شۆخ بوبێتم ؟ (دەچێتە لای ژنەکەوە) دەی قسە بکە سکت بەرزە نازانم بە هەڵەدا نەچوم .؟. خۆت نازانیت لە کەیەوە سکت هەیە ؟!

ژن: هەرگیز من سکم نیە .. بەسیە لەوە زیاتر تاوانم مەخەنە پاڵ .. ئەوە پرسیارێکی کۆچەرییە .. هەروەکو هیواکانمان بەزڕی دەمێنێتەوە ؟

کچ1: ئاوێنەی ئەم مەرگە کۆتاییەیە ..

کچ2: پێدەچێت توشی دەرد بوبم .. ئێوە هەستان پێ نەکردوم ؟ لەوانەیە ئێستا سکم هەبێت ؟ (دەست بەسکی خۆیدا دێنێت)

کوڕ: تۆ قەیرە کچ دیاریت .. دەبێت سکێکت کردبێت ؟!

کچ2: ڕەنگە تۆ هاوسەرم بوبێتی .. گومانی تێدا نییە ؟! لەوانەیە پاش کارەساتەکە یەکتری بناسینەوە ؟

کچ1: چەندم حەز لە سکێکە .. خۆشە مرۆڤ منداڵێکی لە سکدا بێت؟ (دەستی کوڕەکە دەگوشێت) وەرە ببینە ژن و مێرد .. دەستت بخەرە ناو دەستمەوە .. جوان بیگوشە .. (لێوی یەکتری دەمژن) دەی جوان ناودەمم هەڵمژە .

کوڕ: لەم جێگە نەفرەتیەدا تام ناکرێت .. ئەو لەزەتە خۆشەی تۆم لە دەست چو .. هەستم بە خۆشی نەکرد .

**ژن: مەرگ چاوەڕێم دەکات .. ئێوە گوێتان لە دەنگی کڕوزانەوەی مرۆڤی بێ دەرەتان نییە ؟!.. ئای من گوێچکەم کەڕ بو (بە هەمو هێزی هاوار دەکات) دۆزەخی مەرگی هەزاران بێ جێ و نەوایە ..**

**کچ2: ئای خواوەند ئەوە کارەساتێکی سەختە لەوانەیە ئەو ژنە ئەژدیهایەکی بێت ؟!**

**ژن: ئەوە تەنیا قسەیەکی پڕوپوچە .. من تەنها ژانێکم هەیە .. کێ ئەوە دەسەلمێنێت کە سکم هەبێت ؟!**

**کوڕ: ئەو پێشهاتە ترسناك دێتە پێش چاو ..**

**ژن: تۆ قسە مەکە دەزانیت چی چڕو چاوێکی ناشرین و قەڵبت هەیە .. بەتەواوی ئەو تاوانە بەسەر خۆتدا دەسەپێنێت ..**

**کوڕ: کام تاوان ؟ (لێی دەچێتە پێشەوە) دەی خانم چی تاوانێك؟**

**(ژن سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ دەکاتەوە و دەگری)**

**کچ1: ئەو خانمە چەند شێواوە بەچکە فێڵێکی نەبێت چاکە ؟!**

**کوڕ: ئاویش لێرە گڕ دەگرێت ..**

**کچ2: خانم تۆ سکت هەیە (لە ژنەکە دەچێتە پێشەوە) ئەوە شتێکە ناشارێتەوە .. دەی زو بکە هێز بەرە بەر خۆت بەڵکو ڕزگارت بێت ؟!**

**(ژن تورەیی دەیگرێت و بەگریان و قریشك و هورەوە وەکو شێت دەروا قژی خۆی دەرنێتەوە . چەند مەترێك دور دەکەوێتەوە لەشی وشك دەبێت و هاوار دەکات) ئۆف لەشم ڕەق بوە .. فریام بکەون .. خوای دۆزەخ .. (تف دەکاتەوە) (کچ1 ڕادەکات دەستی کچەکە دەگرێت و ڕای دەکێشێتە دەرەوە) خانم تۆ ماکسیەکی تەنکت لەبەردایە .. ئەمە جلی شەوە .. هەست ناکەیت لە خەونێکی خۆشدا سەر گەرم بوبیت و شەوە ڕای ڕفاندبێت ؟!**

**ژن: تف لەم ساتە بۆگەنە (هاوار دەکات و تف دەکاتەوە) چی گێژاوێکە ؟! وەختە بتوێمەوە .. خوا چارەسەرێك ؟ مردنێکی خۆشە .. دەمەوێت لەم دۆزەخەوە لەم شەیتانە ئەبلیسە ڕزگارم بێت ..**

**(قریشکەیەکی توند دەکات و دەکەوێتە قرخە قرخ)**

**(کاراکتەرەکان دەست دەخەنە ناو دەستی یەکتری و ژنەکە دەخولێتەوە پاشان هەمویان سەیری تاریکایەکە دەکەن .. لەگەڵ کزەیەکی تونددا هەزاران قریشکە و هاوار دێتە بەر گوێیان بە ترسەوە لە یەکتری جیا دەبنەوە)**

**کچ1:   ملیۆنەها مرۆڤی تری تێدایە .. سەیری شالاٚوی لاشەو گیان و خوێناو (دەستی ژنەکە دەگوشێت) خانم کاتی تورەیی نییە .. واز لەو شێتیەت بهێنە .. ئێمە هەمومان توشی هاتوین .**

**کورِ: ئەوە مەکسییەکە (رِادەکات دەیگرێتەوە) ئەمە شوێنەواری گەورە کچێکە ..**

**کچ1: ئای لەو ماکسیە .. دەبێت هی چی کچێکی جوان بوبێت ؟**

**کچ2:   هی کچی پادشایەکی بەخشندەیە ... سەیری چی قوماشێکە داخەکەم رِەنگی دیاری نییە .. لەبەر چاوم لە چەند رِەنگێك دەروانێت .**

**کورِ:   تێکەلاٚوی ئەم مردنە ناکاتە بوە .. لەم تاریکیەدا رِەنگی ئاوێتە کراوە ..**

**(کاراکتەرەکان سەیری دەکەن و بەیەکەوە دەکەونە سەمایەکی شێتانە .. مەکسیەکە هەڵدەسورِێنن و سرود دەڵێنەوە)**

**بوکە شۆخەکەی دڵی خاك و خۆڵ خۆی کردە بەربوك***

**ئەویش خۆی سوتاند !**

**هەوا گرِی گرت .**

**نەوت بو بە ئاو !**

**هەور بو بە خۆڵ !**

**خێو بوە مرۆڤ !**

**مرۆڤ بو بەتەم !**

**خۆڵ بو بە جامێك ئۆقیانوسی چۆڵ!**

- **لاپەرِە 94 لە قەسیدەی (جیهان و پشویەکی مەرگاوی)(کفن پۆش و کەون (صلاح جلال)) .**

**(مۆسیقای مەرگ تاریکستانەکە دەهێنێتە لەرزین . کاراکتەرەکان لەجێی خۆیاندا بێ دەنگ دەبن سەرکردەی سوپایی بە بەرگی سەربازییەوە دێتە سەر شانۆ نیشانەکانی سەر شان و لاملی دەر دەکەون شوشە شەرابەکەی بەدەستەوەیە و قومێکی لیٚ دەدات)**

**سەرکردە: وەرنە پێشەوە بزانم کەستان رِاپۆرتێکتان ئامادە کردوە؟ وەرن پێشنیازی خۆتان بکەن .**

**(کاراکتەرەکان بەسەرسامیەوە لە سەرکردە ورد دەبنەوە ئەویش دەستی چەپی بەسەر قەمەکەی قەدیەوە دەگرێت و بە تورِەییەوە سەیریان دەکات)**

**کچ2:   رِاپۆرت ! دەبێت مەبەستی لەچی بێت ؟!**

**کورِ:    یەکەم جارمە ئەو ناوەم بێتە بەر گویٚ ..**

کچ1:   ڕاپۆرتی ئێمە تەنها لەبیر چونەوەیە .. ئەو پێشنیازەیە کە دەمانەوێت .. تەنیا ڕزگارییە .

سەرکردە:  ڕزگار بون !! (پێدەکەنێت) ئەمەش مەحاڵە .. تەنیا خەیاڵ پڵاوە .. دەبێت ڕاستیەکانتان نەدرکێنن و ئازاد بین ؟!

کوڕ:  ئێمە لەئاستی ئەو راستیانەدا لاڵین..کەڕین ..توشی دەردێك هاتوین خۆمان بزر کردوە ..

کچ1:  دەبێت راستی چی بێت؟ لاپەڕەی ئەم مەرگە یاخود مردنێکی تر؟!

سەرکردە:    بەڵێ ئەو مردنەی پەیوەندی بەم گیان کێشانەتانەوە هەیە .. تا زوە ڕاپۆرتەکانتان بخەنە رو.

ژن:  راپۆرت.. ئای چ ناوێکی نامۆیە؟ (دەقریشکێنێت) راپۆرتی ئێمە ئازارو ژانێکی خۆکردە  دەی سەرکردە تۆماری بکە ..بینوسەرەوە .. دەی بزانم بۆچی ئەم سکەت پێ هەڵئاوساندوم ؟!

سەرکردە:  ئەوەش ڕاستیە خانم پێ لە تاوانەکانی خۆت دەنێت ..گوناهەکانی دەردەخات..راستە ئەو سکەی گەورەترین تاوانە .

ژن:  تاوان ..گوناه ... لەم چارە رەشیە (قژی دەرنێتەوەو دەقیژێنێت   ... سەرکردە لەچاو ون دەبێت ..پاسەوان لەسەر شانۆکە وە دەردەکەوێت ..زنجیری زەنگە کە ڕادەکێشێت . کاراکتەرەکان بە لەرزەوە  زمانیان لە گۆ دەکەوێت ..تیشکی تاریکی و رونی دەچێتە سەر پاسەوان بەناو تاریکستانەکەدا شەوق دەداتەوەو دەکوژێتەوە ..لەگەڵ دوا تاریکیدا  تیشك دەچێتەوە سەر سەرکردە ..بەهێواشی دێتەوە سەرشانۆ ..پۆستاڵ و داڵەکەی ناوچەوانی بریسکە دەدەنەوە ..نیشانەکانی سەر شان و لاملی بەرەنگێکی سورەوە دەردەکەوێت ..شوشە شەرابەکەیشی تیشکێکی زەردی دەچێتە سەر).

سەرکردە:  دەی کێ ڕاپۆرتێکی ئامادە کردوە ؟! (کاراکتەرەکان بەناو یەکتریدا شەل و کوت خۆیان بەیەکدا دەدەن و وەکو شەق شەقە دەلەرزن)

ژن:  دەبێت بە سەرکردەیەکی رامیاریمان بزانێت؟ ئۆف چی نەهامەتییەکە؟

کوڕ:  رەنگە سوپا سالاری لەشکرێکی شەڕ کەر بوبین؟ کێ دەڵێ بە سەرکردەی جەنگی جیهانی نەژمێردراوین؟

کچ1:  دەبێت سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان بو بین؟

کچ2:  کێ لەئێوە خۆی بەسەرۆك کۆماری ولاتێکی کاول دەبینێتەوە ؟!

ژن:  تۆمەتێکی گەورەمان دراوەتە پاڵ (دەخولێتەوە)

**سەرکردە:** پێویستە رون تر باسی تاوانەکانتان بکەن(بەهێواشی هەنگاوێك دەنێت ..مۆسیقایەکی جەنگی لەگەڵ جولآنیدا لیّ دەدرێت) تێگەیشتن ؟ بزانن باشتر دەکەونە گوتنی راستیەکان؟!

**کچ2:** کام راستی ؟ رەنگە ئەم قسانەشت لەسەرمان کردبێتە ماڵ ..سەرکردە ئێمە هیچ هۆشێکمان نییە ..نازانین چی دەڵێین؟!

**کوڕ:** وەکو شێت قسە دەکەین ..دەمانەوێت لەو راستیانە بگەین کە بە تۆمەت خراونەتە پاڵمان ..هەوڵی دۆزینەوەی خۆمان دەدەین.

**کچ1:** ئێمە شێتین .. بەدوای شێتخانەیەکدا وێڵین (هەڵدەبەزێتەوە)

**سەرکردە:** دەتانەوێت وێنەی خۆتان بهێننەوە بەر چاوتان ؟ ها..(قیژەیەك دەکات تابلۆیەکی ئاوێنەیی دەردەکەوێت چەند تیشکێکی دەچێتە سەر کاراکتەرەکان لە ناویدا رەنگ دەدەنەوە هەر یەکە دە ئەوەندەی خۆیان لیّ دێت .لەتاوا رو وەردەگێڕن و بەترسی مەرگەوە باوەش بەیەکتریدا دەکەن)

سەیری خۆتان بکەن ئەوە کامێرایە..

**کچ1:** دەمانەوێت بزانین چین ؟! ئۆف بوین بە دەعبا ..کراینە جانەوەر. ئەوەندەی نەما بو رەنگی ئەژدیها بگرین..

**کوڕ:** ئەمە ئاوێنەی ناو دۆزەخی تاریکی بو ..بەشێك بو لەو چاو بەستەیەی کە بەسەر و چاوی مرۆڤی ژێردەستەدا دەدرێن.

**کچ2:** ئاوێنەی مەرگە کۆتاییەکان بو..

**ژن:** شاردنەوە و داپۆشینی راستیەکانی ژیان بو ..ئەو تیشکە بو کە هەزاران وەکو منی توش کردوە ..شەوقەکەی سکمی هێنایە خوار..جارێکی تر هەڵمی ئاوسان ..ئێستا لەلام رونە بە ئەفسانەیەکی وا سکم پڕ بوە ؟! ئێوەش وەکو منتان لیّ دێت..سەیری سکتان بکەن .

(سەرکردە قاقایەك دەکێشێت و لە کچ1 دەچێتە پێشەوە) ئێستا گومان دەکەیت چەند تاوانباریت هەستت بەخۆت کردوە ؟

**کچ1:** پێناسەی خۆمان دەکەین و هیچی تر..

**سەرکردە:** گومانی تێدا نییە تاوانبارێکی گەورەن ..

**کچ2:** دەبێت بۆمان رون بێتەوە تاوان چی دەبەخشێت؟

سەرکردە: هەزاران ، ملیۆنانی وەکو ئێوە هاتونەتە ئەم جێگەیەوە. ئەوانەی گوناهبارن لێرەدا سزا دەدرێن (بە تورەییەوە قومێك لە شەرابەکە دەدات و روانینی تێکەلأو دەبێت.. لەگەڵ هێڵێکی ترسناکدا چاوی دەتەنرێ ولە کاراکتەرەکان دەچێتە پێشەوە):

ئێوەش کۆمەڵێکن لەوانەو سزایەکی توندتان لەسەرە

ژن: ئۆف ..لەو تۆمەتە بۆگەنە ..خوایە ئەمەت لەلا ڕەوایە ؟!(هاوار دەکات و قژی خۆی دەڕنێتەوە ) ئەم بێ دادیە هەتاکو کەی؟ ئەو زوڵمە کۆتایی نایەت ؟

(هەردو دەستی دەخاتە سەر سکی ) ئۆف .. ئەمە سزایەکی نارەوایە ..بوختانێکی چەپەڵە (قریشکەیەکی بەهێز دەکات). (هروژمی شێیەکی تاریك دێت.. سەرکردە لەچاو ون دەبێت .. لەپڕ بەقاقای پێکەنینەوە دێتەوە سەر شانۆ ..چەند تیشکێکی تێکەڵ لاشەی دەگرێتەوە ..لەپڕ تەنها داڵەکەی ناوچەوانی بریسکە دەداتەوە نیشانەکانی سەر شان و لاملیشی شەوقێکی سوریان سەر دەنیشێت .. تاریکیش دەچێت سەر لاشەی)

سەرکردە: ئێستا تێگەیشتین تاوان مانای چی ؟ بێ گومان واتای سزاش دەزانن ..

ژن: کەواتە ئێرە سزا خانەی بێ تاوانەکانی ژیانە ؟!

کچ1: شك نابەم کەسمان تاوانێکی کردبێت (لە خۆی دەڕوانێت) گوناه ..هەرگیز ئەوە بوختانێکی نارەوایە؟!

ژن: وەکو فریشتەیەکی تازە پاك و پوختەین ..

سەرکردە: ئەی سکەکەت ئەوەش فریشتەیە تیە ؟!

ژن: (دەحەپەسێت و دەمو چاوی بەیەکدا دەدات و دو هەنگاو دەڕوات و لەگەڵ ناڵینێکی خەفەدا قاچ هەڵ دەهێنێتەوە )

سك ..منداڵبون ..ئەمانە سزایەکی سەپێنراون .. تاوانێکن بێ مانا .ئۆف لەم بێ عارییە (وەردەگەڕێتەوە تورەیی دەیگرێت) سەرکردە مانای ئەمە چییە ..ئەمە تاوانە ؟!

سەرکردە: گرنگ ئەوەیە سکت بەرزە .. منداڵت دەبێت . ئیدی تاوان لەوە رون تر چی ؟!

کوڕ: هەمو شتێکمان بە دەم سەرِ سەڕی ئەم تاریکستانەوە لەبیر چۆتەوە (لەسەرکردە نزیك دەبێتەوە ) بەو چەشنەش مرۆڤ تاوانبار ناکرێت .. ئەو خانمە پاکە پاك ..

سەرکردە: (قاقا دەکێشێت ) جوان .. بێ گەرد..خاوێن (تورەیی دەیگرێت ) ئێوە لە هەمو گیان لەبەرێکی دڕندە پیسترن دەبێت بەجۆرێك تۆڵەی ئەم دەم درێژیەتان وەر بگرنەوە تالأو بچێژن ..

کچ1: کێمان هەست بە قورسایی خۆی دەکات ؟!من خۆم بەجرِو جانەوەر دەبینمەوە ..

ژن:    ئەوا نۆرەی گیان دەرچونمانە ..لەوەداین بەتەواوی گیان بسپێرین ..سزا لەوە توندتر چی ؟ (دەست بە شیرەیەکی ترسناك دەکات) سەرکردە فەرمو سزامان بدە..با بەیەکجاری بتەقێینەوە ئۆف ..خەریکە دەمرم سەرکردە (لەشی دەلەرزێت گورج قومێك لە شەرابەکەی دەدات و بە تورەییەوە دەکەوێت قسە) ئێوە دەتانەوێت بەگێلی سەر لەمن بشێوێنن .لەژێر دادگای راستیدا خۆتان دەرباز بکەن .من هیچم لیٚ بزر نابێت (رو دەکاتە ژنەکە) دەی بیٚ باك سەیری سکەکەت بکە بزانە ئەمەش تاوان نییە ؟! (کاراکتەرەکان بیٚ دەنگ دەبن .. سەرکردە دەکەوێتە جولاٚن ..مۆسیقایەکی سەربازی لەگەڵ هەناسەکانیدا لیٚ دەدرێت.. لەگەڵ خامۆشیەکەیدا تورەیی دەیگرێت و دەنەرێنێت):

دان بنێن بەتاوانەکانتاندا هەتا سزای خۆتان وەر بگرن.

کورِ:    ئێمە رێبواری گەردەلولێکی نەهاتین .. لەبەر سەرِ سەرِدا ئارامی مەرگمان گرتوە.. هەمو شتێك لەبەرچاوماندا دەبێتە وێنەی ترسناك .

ژن:    خواوەند بێتە فریامان ..من توشی دەردێکی ترسناك هاتوم (هاوار دەکات و دەناڵێنێت) ئای لەم نەفرەت خانەیە ؟

کچ1:   تروسکەی ژیان کەوتۆتە ناو بیری تاریکەوە (سەرکردە لەسەر یەك قاچ خول دەخوات ..ئەوسا قومێك لەشەرابەکەی دەدات ..شوشەکەی بەرەو رویان دەگرێت ) ئەها پێکی ئەم شەرابە چەند خۆشە ..دڵفرێنە ..ئێوەش ئەمەتان خواردۆتەوە ..بیٚ گومان دزیتان کردوە ..

کچ2:   شەراب !! کەستان دەمتان بۆ بردوە ؟

سەرکردە:    شکی تیا نییە بۆیە بیٚ هۆشن ..ئەمە تەنها بۆ منە .. گەوجینە کێتان خواردوتانەتەوە ؟

کچ1:   دەبێت شەراب زۆر خۆش بێت ؟! مرۆڤ دەخاتە سەما ..

سەرکردە:   تۆ زۆرت حەز لە سەما و بالیە خانەیە ..دە راستیەکانت بڵیٚ با رِزگارت بیٚ ..بزانم لەم شەرابەت خواردۆتەوە؟!

کچ1:   سەیرم بکەن بزانە لەشەراب خۆر دەچم ؟ ئاخۆ رِۆژێك لەرۆژان قومێکم خستۆتە سەر لێوم ؟.

کورِ:   سەرپاکمان گێژ بوین کەوتوینەتە ناو تونێلی پێچاو پێچەوە ..ئیتر هەست بەشەراب خواردنیش هەر بەو چەشنەیە ..

ژن:   ئای لەو شەرابە چەندە بۆگەنە تف.. تف.

کچ2:   ئەم شەرابە نەفرەتییە مەستی کردوین .

کچ1:   دەبێت سەرخۆش بو بێتین ؟! رەنگە هەریەکی دو شوشەمان لیٚ نۆش کردبێت ؟!

ژن:    دەبێت ئەو ژەهراوەمان خواردبێتەوە ؟!

**كوڕ: ئەو شەرابە ئەفسانەیەكی تاریكە ..هەروەكو ئەم خەونە نەزانراوەی ئێمەی خستۆتە ئەم تاریكستانە بۆگەنە .**

**كچ1: (دەكەوێتە سەما ) من شەرابم خواردۆتەوە.. بیٚ گومان ئەو شەرابە لەكەللەی داوم .ئای چی زەنگاوێكە؟!**

**كچ2: سەركردەی مەزن قومێكم بدەریٚ بزانم تامی چۆنە ؟( لێی دەچێتە پێشەوە سەركردە قومێك بەسەر و چاویدا دەكات كچ 2 دەبورێتەوە)**

**ژن: ئای سەركردەی خوێن مژ ئەو كچەت كوشت ؟ تۆ زۆر تاوانباریت (هاوار دەكات ) كوا دادگایەكی راستی ؟!**

**كوڕ: (دادەنوێتەوە سەر كچ 2 دەست بەسەر و قژیا دەهێنێت)**

**بوراوەتەوە هۆشی بەخۆی نییە ..(دەست دەخاتە سەر سنگی ) هەناسەی بەحالٚ دێتە دەر لەوەدایە بمرێت ..(هەڵدەستێتەوە رو دەكاتە سەركردە) مراندت تەواو دەستی تاوانباری خۆت بەسەردا سڕی .**

**(كچ1 مەمكی دەردەخات و بەلەنجەوە لەسەركردە دەچێتە پێشەوە) وەرە سەركردەی مەزن دەست بخەرە ناو دەستمەوە .. بائێمەش ڕزگارمان بێت (دەستی دەگرێت سەركردە خۆی لیٚ را دەپسكێنێت)**

**سەركردە: دور بكەوەرەوە سۆزانی تۆ زۆر گوناهباریت .**

**كچ1: بیٚ گومان گوناهێكم نییە ..تاقە تاوانێكم ئەوەیە خۆشم دەوێیت.. دەمەوێت دڵداریت لەگەڵدا بكەم ..هەتاوەكو ئێمەش لە نهێنی ئەم دۆزەخە بگەین (تەواو مەمكی بۆ دەردەخات)**

**سەركردە: بڕۆرە دواوە (تورەیی دەیگرێت ) لێم نزیك مەبەرەوە بیٚ ئابرو .**

**كوڕ: (دادەنوێتەوە كچ 2 هەڵدەستێنێتەوە) هەستەوە بزانم ئەو ژەهرە چی تالأوێكی پیٚ بەخشیت؟!**

**(كچ2 راست دەبێتەوە) كوشتمی .. هێڵنج دەدەم ..خەریكە دەمرم ..جەرگم بڕاوە..**

**ژن: هەمومان مردوین ..پریشكی خوێناوێكی ئاوێتە سەر و ڕوخسارمانی گرتۆتەوە..**

**كچ1: (سەر سنگی دەكاتەوەو لەسەركردە دەچێتە پێشەوە) سەركردەی پایە بەرز (دەستی دەگرێت سەركردە پاڵێكی پێوە دەنێت)**

**سەركردە: داوێن پیس (مۆڕەیەكی لیٚ دەكات)**

**كچ1: ( دەست بە مەمكیەوە دەگرێت وهەڵی دەگلۆفێت) ئەها سەركردە چەند جوانە ..دەڵێی شەمامەیە.. ئارەزوت ناجوڵێت ؟! دەی سەركردە ی خۆشەویست وەرە یاری پیٚ بكە . (خۆی لەسەركردە نزیك دەكاتەوە و یاری بەمەمكەكانی خۆی دەكات پەلاماری شەرابەكەی دەستی**

سەرکردە دەدات ..سەرکردە خۆی رادەوەشێنێت و شەرابەکە بەسەرو چاوی کاراکتەرەکاندا هەڵدەپرژێنێت و بەهەمو هێزی هاوار دەکات ) زەنگ...زەنگ..(تاریکستانەکە دەکەوێتە سەر زەلزەلەی مەرگ !! چەند مۆسیقاو زەنگێکی تێکەڵاویش بەتیژی دێت لەگەڵ زرمەی پۆستاڵە سورەکانی سەرکردەدا بەهێزتر لێ دەدرێت)

## بەشی چوارەم:

(تەم و خومارێکی تاریك تاریکستانەکە دەگرێتەوە ..پیانۆ و مۆسیقای جەنگی بەهێز بەتێکەلاوی لیَ دەدرێت ..بروسکەی تیژیش لەراست و چەپ دەکشێت ژن بەهێواشی لەجێگەی خۆیدا بەرز دەبێتەوە و بەنەرمە چەپۆك بەخۆیدا دەمالێت . شنەیەکی بەهێزیش بەسەریدا دەکشێت و قژی پەخش دەکاتەوە )

ژن: مردم ..گیانم هاتۆتە سەر لوتم ..ئای لەم تونێلە تارە ..چۆن توشی گێژاوی مەرگی ناکات بوین ..(بەئازارەوە لەجێگەی خۆیدا وشك هەلدێت و دەنالێنیَ)

کوڕ: چەند ڕێگەیەکی سەختە..هەناسەم سوا بوە ..دەبێت ژەهرم قوت دابێت ..

کچ2: پرۆڤەی مەرگێکی روتە ..ئۆف ..لەشم بەجاریَ دادەڕزێت..

کوڕ: هستریام گرتوە ..دەردێکی بیَ دەرمانە ..ئۆف.. لەوەدام بەسەر خۆمدا بتەقمەوە..

کچ1: ئەوەی چاومان پێی دەکەوێت نایەتە خەیالیشەوە ..لەناو بۆگەنی مەرگەساتێکدا دەخولێینەوە گیانمان هاتەدەر..

ژن: مەرگ!! مەرگ! سەدقات لەم مردنە گوماناویە خۆشترە ..تف..لەم حالە بۆگەنە (نالەیەکی بەهێز دەکات) ئازارێکی توندم هەیە دەردێکی بیَ چارەسەرم گرتوە .(رەشەبایەکی توند دێت کاراکتەرەکان لە جێی خۆیانەوە رادەوەشێن ..تاریکستانەکە گێژەلوکەی مەرگی تێکەلاو دەیگرێتەوە ..شەپۆلی هەزاران کەللە سەر لەناو هێلە ترسناکەکانیدا دیاری دەدات)

کچ1: ئەمە بای سەرە سەرە ..لێرەدا کلاو ڕۆژنەی دۆزەخ دیاری دەدات ..بەئاشکرا مردوە کانی ناو گڕو دوکەلَ دەردەکەون.

کچ2: سەدان ..هەزاران.. ملیۆنان..لاشەی تیا بەدی دەکرێت ..ئۆف.. چی وێنەیەکی سامناك بو.. وەکو فۆتۆی جیهانێکی مەرگاوی هاتە بەرچاوم .

ژن: بەم ژانە ناکاتەوە ئەو بروسکانەش هێندەی تر خوێنەکەمیان خرۆشاند ..بایەکی هێندە ژەهراوی بو هێندەی تر سکم ئاوسا ..ئێوە سەیرم بکەن بزانن چیم لێهاتوە ؟!

کوڕ: بایەك بو پڕ لەتێزاب و ژەهر و ئاگر..پێستی هەمومان کەوتە سەر خرۆشێکی گیان کێشان..هەمومان تۆوی سەرەتانێکی نەبین لەلەشمدا رواوە.

کچ2: وەکو بەردی بن گۆممان لیَ بەسەر هاتوە ..بەبیَ ئەوەی هۆشمان بە خۆمان بێت تەواوی شەپۆل و شمشێرە تیژەکان سەرمان دەبڕن .

کوڕ:   جەستەمان مۆمیا کراوە هەست بەهیچ شتێکی شاراوە ناکەین..

ژن:    هەر وەکو بەناو چینەکانی ئاسماندا تور درابێتین ..ئەم جێگەیە سەر زەوی نییە ؟

کچ1:   هەمو شتێك لەجێی خۆیدا شەپۆل دەدات مێشکمان بوە بە پاپۆڕی ناو و  لافاوی دەریا.

کوڕ:    تەنانەت بروسکەو باران و هەڵم و شەپۆل و ئاگر و ئاسن هەموی لێرەدا بەسەر یەکدا ترشاوە.

(کاراکتەرەکان سەیری قوڵایی تاریکاییەکە دەکەن ..شەپۆلەکان پتر دەبن و قریشکەی بەهێزیش دێتە بەر گوێیان.. بەترسەوە رو وەردەگێڕێن)

ژن:   هەرگیز دۆزەخ بەو چەشنە نییە ؟!

کوڕ:    دەبێت دۆزەخیش لێرەدا توابێتەوە ..پێدەچێت گەردون تەقیبێتەوە و خۆر و مانگ و بەهەشت و وەیل تێکەڵاو بوبێت ؟

کچ2:   کێ ..دەڵێ ئەستێرەیەك لە مەداری خۆی لای نەداوە و زەویشی پێوە هەڵگەڕابێتەوە ؟!

ژن:     دەبێت گاکەی ژێر زەوی جولابێتەوە و جیهانی خاپور کردبێت ؟!

کچ1:   (دەستی کورەکە دەگرێت) وەرە با خۆشەویستی بکەین ..تازە جیهان قڵپ بۆتەوە ..ئەمە دوا هەناسەمانە ..با دەم بخەینە ناو دەمی یەکتریەوە (یەکتری ماچ دەکەن)

کوڕ:   خۆزگە ژن ومێرد بوینایە ..ئێستا حەز دەکەم خۆشەویستێکم هەبێت ؟!

کچ1:   ئەو ساتە لە هەمو شتێك دەگەیشتین ..ئەم شیرازە پچڕانەمان بۆدە دۆزرایەوە..

ژن:   ئۆف مامانێکی نەفرەتی نییە ..هەتا نهێنی ئەم سکەم ئاشکرا بکات ؟ لەم رارایيە ..هەرگیز هەست ناکەم سکم پڕ بوبێت؟  (دەقیژێنێت و بەخۆیدا دەماڵێت ) ترسناکی جەستەمی شێواند ..لەوانەیە دڕندەیەکم ببێت ؟!

کچ2:     هەمو شتێك گومانی لێ دەکرێت ..دور نییە پڵنگێك ،شێرێکی ببێت؟

کچ1:   (دێتە لای ژنەکە ) دەتەوێت دەست بەسکتا بهێنم (دەست دەخاتە سەر سکی ) هەست دەکەیت کەمێك هێدی بوبێت؟!

ژن: مردم واز بهێنە ..ئازارێکی بەهێزم هەیە ..ئەمە تاوانێکی سەختە نوسراوە..هەرگیز نایەتە عەقڵەوە سکم کردبێت؟! تەنها شوێنەواری ئەو بۆمبە نەفرەتییە یە (دەقیژێنێت)

کوڕ:   ئەنجامی ئەم ژیانە سەر سەختەیە ..رەنگە لەوەش زیاتر ئازارت بدات ..ئەم جێگەیە مایەی نغرۆ بونە ..نەك ژیانەوە..

کچ1: ئای بۆ پزیشکێك ؟(رو دەکاتە کچ2 ) خانم تۆ تەنها ڕۆبێکت لەبەردایە لات وانییە مامانێکی کارامەو لێزان بوبیت ؟!ئەم تەوقە سپییەی سەریشت ئەوە دەسەلمێنێت..

کچ2: مامان !! (لەخۆی ورد دەبێتەوە) دەبێت مامانێکی خنجیلە بوبم و دەستم بەسکی سەدان ژندا هێنابێت؟!

کوڕ: مامانەکانیش خراونەتە ناو ئەم دۆزەخەوە..

ژن: شوێنەواری ژیان تەنها ئێمەین ..ئیدی کسك لەهەر هەمو شتێکی تر دراوە..

کچ2: کێ لەئێوە دەزانێت کات چەندەیە ؟ شەوە یان ڕۆژە؟

کوڕ: سی وهەشتی مانگە ..رەنگە چل ودوش بێت؟

کچ1: چاوم بەکات ژمێر نەکەوتوە (سەیری دەستی دەکات) ئەها مەچەکم زنجیریشی تێدا نییە ؟

ژن: ئێرە جیهانێکی بێ کات وشوێنە هیچ شتێك دیاری ناکرێت .

کچ2: بەڵێ ..سەیر بزانم لەسەر چی وەستاوین؟ (دەست رادەکێشێت و سەمایەکی هیستریانە دەکات ) هەمو پەڵە هەوری ترسناکە ..

کچ1: سەد ساڵە خۆرم نەدیوە ..

کچ2: هەرگیز چاوم پێی نەکەوتوە ..دەبێت رەنگی چۆن بێت؟

کچ1: یان رەشە یان سەوز؟!

کوڕ: خۆڵە مێشییە !

ژن: قاوەیی یە !

کوڕ: ساڵەهی ساڵە نەم دیوە مانگێشم چاو نەکردوە.

کچ1: دەبێت کوژرا بێت ؟!

ژن: لەو خەونەدا دیتم ..قاوەیی یەکی مەیلەو شەکەری بو.

کوڕ: ئەگەر نەمردبێت لەوێوە سەر دەردێنێت (دەست بۆ شانۆ ئەفسانەییەکە درێژ دەکات)

(کاراکتەرەکان چاو دەبڕنەشانۆکە،تاریکیەکی تەڵخی بەسەردا دەکشێت و هەرچواریان بۆی دەچن)..

ئێمەی کلۆڵ..

بەسەر دڕك ودالْ وبەردا..

ڕێگە دەبڕین، بۆ سەر لوتکەی گڕی دۆزەخ!

گەرچی ڕێگە تارو لێل و ترسناکە،

گەردون بۆتە نەشتەری تیژ..

لەتیَ گویَزانی خویَناوی،لەسەر ریَدا چەقیَنراوە..

بەلاَم دەروَین..هەتا تروَپك..

هەتا گزنگ سەر دەردیَنیَ،دەروَین .. دەروَین.

(قولاَیی تاریکی پتر دیَتە بەرچاویان ..لەبەردەم شانۆ ئەفسانەییەکەدا وشك دەبن ..پاسەوان بەبەرگی ئەفسانەییەوە تیشکی دەچیَتە سەر..زنجیری زەنگەکە رادەکیَشیَت وهاوار دەکات سەدان قەپاَلی زل بە هاژە و قیژەیەکی بەهیَزەوە دەم دەکەنەوە چەند مۆسیقایەکی دلَ تەزیَنیش لیَ دەدریَت کاراکتەرەکان وەکو داری بەر گەردەلول دەلەرزن و بۆ جیَی خۆیان دەگەریَنەوە پاسەوان بە پیَکەنینیَکی گاَلتە جارییەوە تیشکی دەچیَتە سەرو بەناو تاریکیەکەدا سەدان شەوق دەداتەوە )

پاسەوان: ئەها ..ها ..سزا..سزا..

کچ1: سزا..سزا..سزا.. (سوریَکی توند دەخوات) دەبیَت مەبەستی چی بیَت رەنگە ئازادمان بکات؟!

کور: ئەم قسەیەی تەنها نەجات بونمانە لەم کیَشەیە ..ئەویش هیلاك بوە.

کچ2: دەیەویَت بەیەکجاری لەناومان ببات ..حەز دەکات بمانکاتە خۆراکی ژەمیَکی خۆی ..

ژن: لە دەست ئەم درندەیە رزگاربونمان نەبو؟! ئۆف.. چی بەلاَیەکە؟ لەشم دەزیریَنیَت (قیژەیەکی ترسناك دەکات) مردم..مردم..کوا تروسکەیەك ؟!

(پاسەوان دەقیژیَنیَت ..بایەکی توند تیَکەلَی مارشیَکی سەربازی دەبیَت بەجاریَك تاریکستانەکە دەهەژیَت ،پیانۆیەکی هیَدی شالاَوەکە هیَمن دەکاتەوە ئەوسا سەرکردەی سوپایی بەبەرگی سەربازییەوە دیَتە پیَشەوە کلاَو خودەیەکی لەسەردایەو دالَیَکی بەسەرەوەیە نیشانەکانی سەرشانی دەردەکەون.. قەمەکەی قەدیشی بەلای چەپیەوە تیشکی سەردەکەویَت ..لەگەلَ زرمەی پۆستاَلەکانیدا مۆسیقا لیَ دەدریَت لەگەلَ قومیَکی شەرابەکەیدا خامۆش دەبیَتەوە)

سەرکردە: کاتی سزایەکی توند هاتوە..ئیَوە ئەم جیهانە بەهیَزەتان گلاَو کرد..رەگی گوناهتان تیَداچاند.

(کاراکتەرەکان ترسیَکی زۆر دەیانگریَتەوە لەشیان دەکەویَتە لەرزین..سەرکردە بەسەریاندا دەقیژیَنیَت) ئەی ئەوانەی کەوتونەتە ناو دەریای تاوانەوە..

ئیَوە درندەی خویَن مژی سەرزەوین.. جیهانتان گلاَوکرد..

کچ1: برستم لیَ براوە ..هەست دەکەم ئەژدیهایەك هاتۆتە ناو گەرومەوە..

**کچ2:** هەرگیز توانای راست بونەوەم نییە ئیتر بەیەکجاری دەمرم..

**ژن:** بروسکەیەك جەرگمی گرتوە .ئۆف چی ژانێك بو ...هەست دەکەم ناو سکم ترشاوە (دەقریشکێنێت) ئەگەر بەچکەیەکی نەفرەتیشم بوبێت ئەوا لەناوسکمدا مردوە ..بوە بەچڵم...

(ڕێشنەیەکی توند بەسەر کاراکتەرەکاندا دێت..پیانۆیەکی ترسناك دەکەوێتە لێدان..لەگەڵ خشەی بەرگە نایلۆنەکی سەرکردەدا تێکەڵاو دەبێت ئەویش بەشوشە شەرابەکەیەوە لەرزینێکی سەمایی دەکات)

**سەرکردە:** تاوانبارەکان راست بینەوە ..

**کچ1:** (بەمەستیەوە هەڵدەستێتەوە) ئێمەتەنها رزگاریمان دەوێت (لەگەڵ راست بونەوەی کاراکتەرەکاندا دەچێتە لای سەرکردەوە) دەی سەرۆکی گەورە وەرە با خۆشەویستی بکەین ..دەی ئێمە ئازاد بکە ..(لەنجەیەکی مەست دەکات و مەمکی دەردەخات)

**سەرکردە:** ئەم قسانە قەدەغەن ..کێ رێی پێداویت ئەو وشانەت لەدەم دەربچێت؟

**کچ1:** من دەڵێم خۆشەویستی ..ژیان ..وەرە دەست بخەرە ناو دەستمەوە..(سەرکردە لەشی دەلەرزێت قومێك لەشەرابەکەی دەدات)

**سەرکردە:** ئێوە دەزانن سزاتان لەسەرە ..هەمو تاوانبارن تۆ ئەی سۆزانی سەر هەتا پات گوناهوتاوانە..

**کچ1:** (لەخۆی وردەبێتەوە ) ئایا مەبەستت چی بێت ؟! گوناهوتاوان کام وشەیەن ..تائێستا ئەوانەم نەبیستوە..

**سەرکردە:** قسەی نەفرەت لێکراو مەکە ..ئێرە دادگایە ..جێگەی وشەی سەوز و سور نییە ..

**کوڕ:** دەبێت تاوانەکانمان ئەوە بێت کە لێرەدا بەند کراوین؟

**کچ2:** هەمو شتێك تاوانبارە ..ئەم ژیانە نەفرەتییە مانای تاوان و گوناهە .

**ژن:** ئەمە مانای تاوانباریە (دەست بەسکی خۆیدا دەهێنێت) ئای لەوئازارە سەختە(دەقریشکێنێت) دەبێت گوناهێکمان هەبێ سەخت بێت سزا بارمتەی نەکات؟!

**سەرکردە:** نابێت ئەم قسانە دوبارە بینەوە..لێرەدا ئەوانە لەیاسا قاچاغن.. (بەسەریاندا دەنەڕێنێت) هەرگیز رێگەی ئەو شتانە نادرێت..

**کچ1:** تاوانێك نییە ئێمەی لەسەر سزا بدرێت..

**ژن:** ناومان نییە هەتا تاوانبار بین..ئێمە لەتاوانە دەرەکیەکان دروست بوین ..خولقاندنی ئەم تاوانە سەختەین ..

سەرکردە:   کەسێك توشی تاوان دەبێت کە بیرەوەرییەکانی خۆی لەبیر بچێتەوە؟!

کچ2:   تاوان ..دەبێت (بەحەپەساوییەوە رو دەکاتە سەرکردە) تاوان..تاوان؟!

ژن:   جەستەم لەدارِزاندنایە ..هاکا بە تەواوی بوم بەخۆڵە مێش .. ئای ..ئای..(قیژەیەك دەکات) .

(بایەکی ئاوێتە خوێن دێت ..کاراکتەرەکان لەزمان دەکەون و سەرکردە لەچاو ون دەبێت لەلایەکی ترەوە دێتەوە سەر شانۆ) .

سەرکردە:   تۆ ئەی ژنی پیس (دەستی بۆ ژنەکە درێژ دەکات) ئایا دەزانیت مێردەکەت لەکوێیە ؟!

ژن:   هەرگیز ئەو تاوانەم مەخەرە پاڵ (بەلەرزینەوە هاوار دەکات) من شوم نەکردوە ..

سەرکردە:   ئایا لەوە زیاتر دەبێت تاوان مانای چی بێت؟

کچ1:   بەو پێە جیهان لەسەر تاوان دروست بوە؟

کورِ:   جیهانێکی تر هەبوە تاوانبارەکان خاپوریان کردوە و ئەم جیهانەیان لەسەر بنیات ناوە..

ژن:   راستە بناغەی ئەم جیهانە تاوانە..پێدەچێت لەکتێبی ئاینی دا باسی لەسەر کرابێت؟

(سەرکردە بەدەوری خۆیدا خول دەخوات .. سەیری قولاَییەکە دەکات شەپۆلەکان هێمن دەبنەوەو روناکیەکی کزیان سەر دەنیشێت لەشی دەکەوێتە لەرزین..دەم بەشەرابەکەیەوە دەنێت..قومێك دەخواتەوەو تورەیی دەیگرێت)

سەرکردە: تف لەئێوە ..نەفرەت لەو کەسەی تاوانێکی گەورە دەکات و لەبیر خۆی دەباتەوە ..

کچ2:   پێویستە سەرفرازبین ..ئێمە هەرگیز تاوانمان نییە ..بیرەوەریمان نییە هەتا پەڵەو سزامان بخرێتە سەر؟!

کچ1:   تۆ سەرکردەیەکی کارامەی ..بەزەیت پیاماندا بێتەوە ..(خۆی لیّ نزیك دەخاتەوەو مەمکی بۆ دەردەخات ) دەی جوان مەمکم بگرە ..دەستم بگوشە .. کەمێك تامی خۆشی بکە ..

سەرکردە:   (توند دەستی دەگوشێت) وەرە پێشەوە کچەکە.. وەرە بزانم رزگاربونت دەوێت ؟ ئەی تاوانەکانت؟ (توند مەمکی دەگرێت وفرێی دەداتە ئەولاوە) دەی بزانم دەتەوێت ئازاد ببیت ؟

کچ1:   لەم بەدبەختییە (خۆی دور دەخاتەوە) چەند ترسناکە خەرك بوم بمرم ..هەرگیز لە مرۆڤ ناچێت؟!

کورِ:   گەردەلولی نەهاتییە ..لە قوراوێکی قورِقوشمدا چەقیوین ..ئێرە دۆزەخێکە لەناو دۆزەخدا..

ژن:   خەریکە سکم یەکالاَ دەبێتەوە..تەوژمی ئەژدیهایەکی ترسناك سکمی پێچاوەتەوە (هاوار دەکات و پرچی دەرِنێتەوە) ئۆف چی ژانێکی سەرسەختە .(سەرکردە هەمو لەشی دەلەرزێت ..گورج

قومێك لە شەرابەكەی دەدات ..سەیری تاریكیەكە دەكات  روناكی سەر دەنیشێت .. دەقیژێنێت)
چەند ساتێكی تر كۆتایی بەم شانۆیە دێت ..
(كاراكتەرەكان بەترسەوە سەیری قولاییەكە دەكەن .شەپۆلە ترسناكەكان بەناویدا دەچن تاریكی بەرەو نیشتنەوە دەچێت هەزارەها مۆرەغەو كەللە سەر بەدی دەكەن لەتاوا دەقریشكێنن)  دەمرین ...دەمرین....!!

كچ1:   (دەكەوێتە سەمایەكی ئاڵۆز) ئەمە لافاوی مەرگە ..ئۆقیانوسی مەرگە ساتێكی بێ ناونیشانە.

كوڕ:   شوێنەواری گیان كێشانی مرۆڤی چاو هەڵنەهاتوە ..

كچ2:   دۆزەخی راستەقینەیە..ملیۆنان كەللە سەری تێدا بو..(بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە) زەریای تەرمی بێ تابوتە ..مردوی بێ گۆڕستانە ..

كوڕ:   ئەو جێگە نەفرەت لێ كراوەیە كە گۆڕستانی پێویست نیە ..

ژن:   لەو سامناكییە (قیژەیەكی ترسناك دەكات) لەو مەرگە بۆگەنە ..(كاراكتەرەكان بەیەكەوە دەكەونە قیژەو پەلەقاژەی مەرگ ..باوەش بەیەكدا دەكەن و بەهاوارەوە رو وەردەگێڕن) .

شەپۆلی مەرگی ناوەختە ..

زەریای قوڵی سروشتی گرت..

لەخۆرئاواو خۆرهەڵاتدا... چرای شادی كەوتۆتە ئاو ...

چەقۆی دەستی شەوەی پیاو كوژ ..

هاتۆتە سەر چۆكی كوشتار..

جیهان هەموی بو بەبڵق !

توایەوە

ت و ا ی ە و ە !

(سەركردە دەست بەقۆپچەی سەر سنگیەوە دەگرێت ..هەمویان پەلاماری دەدەن ..گورج لەبەرچاویان ون دەبێت و شەرابەكەی بەرەو روناكیەكە هەڵدەپرژێنێت ..تەم وتاریكی تێ دەخات وهاوار دەكات)  زەنگ .. زەنگ (زڕەی زەنگێكی تیژ تاریكستانەكە دەخاتە سەر شێی تەوژمی دینامیكی )

كچ1:   بروسكە دای لەدڵم ..لەشم سست بوە ..هەروەكو هێزێكی نەبین كێشم بكات؟

كوڕ: تەزوی خێوێكی نەزان جەرگ ودڵمی ڕیشە كێش كرد . تەنانەت روناكیەكەشی شاردەوە ..

كچ2:   جادو بازێكی بێ وێنەیە ..ناكەوێتە دواوە ..! وەكو شەیتان خۆی دەرباز دەكات..

کوڕ:   کەس بیرەوەرییەکی نایەتەوە یاد؟!

کچ1:   تەنها بیرەوەری مردن هەیە ..ئەوەتا لەبەرچاوە هەموتان بیری لیّ بکەنەوە ..

ژن:   سەرتاپای لەشم دەزیڕێنێت..وەکو شەق شەقەم لیّ هاتوە..دەڵێی گاسن ناو سکم دەکێڵێت(قیژەیەك دەکات) ئۆف جەستەم بوە بەکێڵگەی جانەوەران.

(پیانۆیەکی ترسناك لیّ دەدرێت ..تاریکستانەکە دەکەوێتە بەر گەردەلولێکی بەهێز ..کاراکتەرەکان دەکەونە سەمای گیان دەرچون .. سەرکردەش دێتەوە سەر شانۆ ..بەیاسای سەربازی قاچ دەجوڵێنیّ و دەنگی جێگەی پۆستاڵە سورەکانی لەگەڵ مۆسیقاو مارشێکی سەربازیدا ئاوێتە دەبن. قەمەکەی بەقەدیەوە نیشانەی بەرزییەکەی دەکێشێت.. دو تیشکی تێکەڵ دەکەوێتە سەر داڵەکەی و قۆپچە زێڕینەکانی کراسەکەی و قەمەکەی و نیشانەکانی سەر شانی ..هەمویان بەیەکەوە دەردەکەون ... قومێك لەشەرابەکەی دەدات وبەو دیمەنە وە دەوەستێت)

سەرکردە: ئەها (دەست بۆ تارکیەکە درێژ دەکات) چاوتان لێیەتی (دەکەوێتە پێکەنین)

(کاراکتەرەکان چاو دەبڕنەتاریکیەکە  شەپۆلێکی ترسناکی بەسەردا دێت وئاڵۆز تێدەخات)

کچ1:   زۆنگاوی جەنگی سفری گەردونە .

کوڕ:   تەقینەوەی سەرتاسەر ی سروشتە  ..ئێمە کەوتوینەتە دوای هێڵی سفرەوە وەکو لەسەر مەداری ئەستێرەیەکی وێڵدا بخولێینەوە ..

کچ1:   بەنج بوین ..هۆشمان بەسەر ئەو شەپۆلە ترسناکەوە نەماوە ..

کچ2:   کارەساتە سەختە خوێناویەکان لە چرکەیەکدا کۆتاییان پیّ دێت .

سەرکردە:   دەتانەوێت قورقوشم بخۆنەوە ..دیارە حەزتان لەژەهرە مارە ..سەیر هەوڵی خۆ گێل کردن دەدەن.

کچ1:   سەرکردەی ئازیز ..وەرە ئیتر کاتی خۆشەویستیە مادام هەمو شتێك مایەی لەبیر چونەوەیە ..ئەها.. ئەها سەیر چەندە شۆخم ..وەرە ماچم بکە..

مەمکم بلێسەرەوە . بائێمەش ئازاد بین (سنگی بۆ دەردەخات) سەیر بزانە ئارەزوی ناکەیت ؟!

سەرکردە:  چەند پیسیت ..مەمکت پوکاوەتەوە ..ئەوە نیشانەی داوێن پیسیتە ..تۆ لەبالیە خانەدا گەورە بویت ..

کچ1:   من شۆخم ..تەنها تۆ هەستت بۆم نابزوێت (لێی دەچێتە پێشەوە) وەرە سەیرم بکەو جوان مەمکم بخەرە ناو دەستەکانتەوە .

سەرکردە:   تف لەو جوانییەت ..بڕۆ تاوانبار..

**کچ1: زەوقت ناجوڵێت ..هەرگیز نابێت سەرکردەیەکی وەکو تۆ بەبێ خاتونێکی شۆخ ژیان باتە سەر ..وەرە (دەستی دەگرێت و سەرکردە بەتوندی فڕێی ئەداتە ئەولاوە ).**

**سەرکردە: بڕۆ لەبەرچاوم ون ببە ..تۆبەد ناوێت ...هەمو گیانت پڕە لەتاوان .**

**کچ1: بەدناوی سەیرە لەم تاریکستانەدا ..لەم گۆڕە تەنیاییەدا .کۆمەڵە تاوانێکی سەیرمان خراوەتە پاڵ ..ئای ..ئای لەم دادگایە..**

**کوڕ: وەکو ئەو بەندیخانە گۆڕەشاریەی کەتێی کەوتوین .ئەمە ئەو نهێنییەیە کەهەڵنایەت..ئەو پرسیارەیە کەوەلاَمی نییە ..**

**کچ1: وەرە کوڕە جوانەکە ..مادام سەرکردە ئارەزوی خۆشەویستی ناکات ..حەزی لەرابواردن نییە ..وەرە دەستم بدەرێ (دەستی دەگرێت ویەکتری ماچ دەکەن ) ئەها سەرکردە تامی خۆشە تۆش وەرە ماچێکم بکە ..**

**سەرکردە: (لەشی دەلەرزێت.. نیشانەکانی سەرشانی و لاملی یاری دەکەن.. لەتاوا قومێك لەشەرابەکەی دەدات و تفێك دەکاتە کچ1 ) بزربە ..تۆ تاوانێکی ئێجگار زۆرت کردوە ..بەجۆرێك تاڵە مویەکت بە پاکی نەماوەتەوە ..وەکو ئەو گوناهبارانەی تر کەوتویتەتە دەریای گوناهبارییەوە ..**

**کچ2: دادگایەکی بێ خاوەندە ..ناڕەوایە ..هەمو شتێك بێ ئەنجام دێتە پێشەوە ..**

**ژن: لێرەدا مرۆڤ تەنها سود لەکەڕی و لاڵی وەردەگرێت لەکاتێکدا هیچ چارەسەرێك نادۆزێتەوە .**

**کچ1: بەدوای کۆمەڵە وشەیەکدا وێڵین کەنازانین چی یە ..لەسەر چەند مەبەستێکی گلاَو کەوتوینەتە ئەم هەسارەوە کە بێ مانایە و پڕ و پوچە .**

**ژن: ئۆف مردنێکی ناوەختەمان کەوتۆتە ئەستۆ ..کە کاتێك مەرگ بەچاوی خۆمان دەبینین (دەقیژێنێت و قژی خۆی دەرنێتەوە) فریشتەیەکی پاك فریامان بکەوە سەرکردە : سەرەتا تاوان لەو پرسیارەوە دەست پێ دەکات. کەئێوە لەبیر خۆتانی دەبەنەوە .**

**کچ1: دەی سەرکردەی مەزن ئێمە لەسەرەتای پرسیارێکی وێڵداین..بیرەوەریەکانمان شۆراونەتەوە ..دەی ئازادمان بکە..پێویستمان بەرزگاری هەیە .. وەرە لەگەڵما ڕابوێرە ..باشەپۆلەکان هێمن بنەوە !؟**

**سەرکردە: (تورەیی دەیگرێت) بەم چەشنە گێلی مانای سەپاندنی تاوانە بەسەر خۆتاندا ..دەبێت خۆتان سزای خۆتان بدەن.**

**کوڕ: ئەمەش کارەساتێکی سەخت ترە ..پلانێکی بێ ڕێگە و جێیە ..**

**کچ2: بەپێی چرکە نەفرەتییەکان تاوانی تر کەڵەکە دەبێت.**

کچ1: ئەگەر مانگێك بمێنینەوە هەمو تاوانەکانی جیهانمان دەخرێتە پاڵ.

(سەرکردە بەتوڕەییەوە کچ2 بانگ دەکات)

وەرە تۆش تاوانت نییە هەست ناکەیت ئەندازیار بویت؟

کچ2: (بەسەرسامیەوە دەوەستێت) من ..من هەرگیز ..شتی وا ناچێتە عەقڵەوە (سوڕێك دەدات) ئەندازیار ..چەندە خۆشە ئەندازیارێکی شۆخ بوبم ؟

سەرکردە: تەنیا بێ هۆشی ئێوە نەبێت ئیتر هیچ شتێکی تر ناچێتە عەقڵەوە (رودەکاتە کچ1 ) وەرە سۆزانی تۆ پزیشك بویت ؟ بیر بکەرەوە بزانم ناوی خۆت دەزانیت؟!

کچ1: من ..پزیشك (لەخۆی وردەبێتەوە) دەبێت پزیشك مانای داوەری یاسا بگرێتەوە..دەبێت (نەرمە سەمایەك دەکات) دەبێت پزیشك بوبم ؟ سەرکردە وەرە بابینە ژن ومێرد..وەرە...

سەرکردە: (پێکەنینێکی ژەهراوی دەکات) ئەوەیە سەر لێشێوان ..ئەوە خۆی لەخۆیدا تاوانباری دەگرێتەوە ..(رو دەکاتە کورەکە) تۆ قوتابی دانیشگا بویت ؟ ..سەیرکە بزانە چی تاوانێکت کردوەو پێی لێ نانێیت ؟!

(کوڕ لە خۆی وردەبێتەوە ودەحەپەسێت) دەبێت قوتابی بوبم (رو دەکاتە سەرکردە )

سەرکردە چی مەبەستێکت هەیە ؟ ئایا بیرەوەریەکانمان بیر دەخەیتەوە ؟

سەرکردە: لەوە زیاتر وشەی قەدەغە نەڵێنەوە ..زارتان دەبەستم (بەسەریاندا توڕە دەبێت) دەمتان دابخەن تاوانبارەکان.

کچ2: (تەواو سەرسنگی دەکاتەوە و لەسەرکردە نزیك دەبێتەوە بەبێ دەنگی لەبەردەمیدا دەوەستێت ..سەرکردە پاڵێکی پێوە دەنێت)

کچ1: وەرە کوڕەکە با پێکەوە ڕابوێرین ..سەرکردە کچی شۆخی ناوێت (ماچێکی کورەکە دەکات و دەچێتەوە بەردەمی سەرکردە)

ژن: ئای فریام بکەون (لەجێی خۆیدا چیچکە دەکات وقریشکەیەکی بەهێزی لێ بەرز دەبێتەوە) ئۆف ..ئۆف چیم لێ بەسەر هاتوە ؟

کچ2: ئای لەو بەدبەختە ..لەو ئازارە سەختەی ..چی تاوانێکە بەسەریدا سەپیوە ؟ (دادەنەوێتەوە و دەچێتە لایەوە) دەی واخەریکە رزگارت دەبێت.

ژن: تەواو ..ئیتر گیانم دەردەچێت (قیژەیەکی بەهێز دەکات تاریکستانەکە دەگرێتەوە) ئای ..ئای.

کچ1: (سەیری ژنەکە دەکات ودەقریشکێنێت) ئای لەو دڕندەیە (هەردو چاوی خۆی دەقونجێنێت) تەواو دەڵێی ئەژدیهایە ..لەو منداڵە ترسناکە ؟!

(سەرکردە بەو دیمەنە دەکەوێتە لەرزین ..شوشە شەرابەکەی بۆ دەمی دەبات ..تەواوی لەشی وەك شەق شەقە دەلەرزێت ولە دەستی دەکەوێتە خوارەوە لەگەڵ شکانی شوشەکەدا شەپۆلێکی گڕاوی بە ڕوخسارەکاندا دەهێنێت).

کوڕ: ئای سەرکردە گۆج بوە ..وەك ئیفلیج ڕەنگی گۆڕاوە .

(سەرکردە بەپشتا ڕەتەڵ دەدات ..کچی1 گورج قەمەکەی سەرکردە هەڵدەکێشێت ولەسەر دڵی دەیچەقێنێت ..سەرکردە لەگەڵ دوا هەناسەیدا هاوار دەکات)

زەنگ ..زەنگ..!!

(شەپۆلێکی بەهێز تاریکستانەکە دەلەرزێنێت ..تەنها خوێناوێکی ڕەنگاو ڕەنگ بەناویدا شەپۆل دەدات ..پیانۆ و مۆسیقا و مارشە سەربازیەکانیش بەیەکەوە خامۆش دەبن)

سلیمانی 1991/6/14

ئەنتەرنێتی شار 2007/8/8

لەگۆڤاری شاکاری ژمارە 11 و12 ی 2001 بڵاوبۆتەوە. لای شەل و کەرێکی ڕۆشنبیریش بڵاو بوەوە کە هەمویم دراند دوایی جارێکی تر 300 ژمارەم لێ بڵاو کردەوە کە کاك سامی هادی لە کۆمپیوتەری ریکخراوە دیموکراتیەکان یارمەتی دام بویان تایپ کردم و دەزگای سەردەمیش مەبلەغێك پارەیان دامی بۆ راکێشانی 200 کتێب خویشم باقیەکەم سەرخست و 300 دانەم بلاوکردەوە .

## هونەرمەندی دڵسۆز :سەفین قانع : بەبێ بەرامبەرسەرلەنوێ تایپی کردەوە .